

تصوير ابو عبد الرحمن الكردي
خەزنەی
جەواهێر
کۆمەڵە شێعرێکی ئایینی و ئەدەبییە
لەگەڵ
مەنزوومەی ( اسماء الحسنى ) و ( سلسلة المشايخ النقشبندية )
دانراوی:
مەلا ئەحمەدی قازی پێنجوێنی

# خەزنەی جەواهێر

کۆمەڵە شێعرێکی ئایینی و ئەدەبی‌یە

لەگەل

مەنزوومەی (اسماء الحسنی) و (سلسلة المشایخ النقشبندیة)

دانراوی:

مەلا ئەحمەدی قازی پێنجوێنی

سرشناسه : قازی،احمد ۱۹۲۰-۱۹۸۳ م.
عنوان و نام پدیدآور : خه زنه ی جه واهیر/دانائی که حمه دی قازی
مشخصات نشر : سنندج:انتشارات شیخی،۱۳۹۱.
مشخصات ظاهری : ۱۸۵ص.
شابک : ٤-۱٥-٦۳٥۸-٦۰۰-۹۷۸
وضعیت فهرست نویسی : فیپا
یادداشت : کردی
موضوع : شعر کردی -- قرن ١٤
رده بندی کنگره : PIR۳۲٥٦/ س ۱۳۹۱۷٤۳ ٢٤ق
رده بندی دیویی : ۸فقا۹/۲۱
شماره کتابشناسی ملی: ۳۰۰۰۷۳۷

**شناسنامه کتاب**

نام کتاب : خه زنه جه واهیر
مؤلف : ملا احمد قازی
ناشر : انتشارات شیخی
نوبت چاپ : اول
تیراژ : ۳۰۰۰نسخه
قیمت : ٦۰۰۰تومان

انتشارات شیخی
سنندج، پاساژ عزتی
۰۸۷۱ - ۲۲۵۴۱۵۲

مرکز پخش: سنندج - خیابان شهداء - پاساژ عزتی - طبقه همکف
انتشارات شیخی - تلفن:۰۸۷۱-۲۲٥٤۱٥۲

## پێشەکی

بەناوی خوای بێهاوتا

زانای بەرز و خواناس و ئەدیب، کەڵە پیاوی هەڵکەوتوو خوالێخۆشبوو مەلا ئەحمەدی قازی کە یەکێک بوە لە پیاوە بە نرخ و گەورەکانی سەردەمی خۆی هەموو ژیانی لە خزمەت بە ئایین و گەل و وڵاتەکەی بەسەر بردووە لە هەوڵدان و تێکۆشان ساتێک درێغی نەکردوە.

ئەم زانا خوالێخۆشبووە ناوی ئەحمەد کوری مەلا محەمەد کوری کەریم لە هۆزی وەستا حسەینە کە یەکێکە لە هۆزە ناودار و سەرەکیەکانی شاری پێنجوێنی سەر بە پارێزگای سلێمانی. باوکی بە دوو نازناو بەناوبانگ بوە یەکەم: بە خواهرزادە چونکە خوشکەزای زانای گەورە مەلا عبدالرحمان بووە کە بە پێنجوێنی بەناوبانگ بووە.

دووەم: قازی چونکە زانایەکی هەڵکەوتوی ناوچەکە بووە و لە لایەن میری ئەو سەردەمەوە کراوە بە قازی و مزگەوتێکی بە ناوی مزگەوتی قازی لە پێنجوێن بۆ دروست کراوە و بووە بە ئیمام و وانەبێژ و مودەریسی ئەو مزگەوتە

ئەم گەورە زانا لە ساڵی ۱۹۲۰ زاینی بەرابەر بە ۱۳۳۸ کۆچی لە شاری پێنجوێن چاوی بە دنیا هەڵهێناوە هەر لە تەمەنی منداڵیدا دایکی کۆچی دوایی ئەکات.

سەرەتای خوێندنی لە خزمەت باوکیدا دەست پێکردوە و پاشان بە شێوەی یاسای ئەو سەردەمەی کوردستان بۆ فەقێیی و خوێندن کوردستانی ئێران و عێراق گەڕاوە لە ناوچەی سلێمانی و قەرەداغ و

سەنگاو و بیارە و چەند شوێنێکی‌تر لە کوردستانی عێڕاق خوێندویەتی و ئینجا ڕۆیشتوە بۆ کوردستانی ئێران لە ناوچەکانی بانە و سەقز و موکریان و مهاباد و شنۆ و لاجان خوێندویەتی وە لە مەدرەسەی زانای گەورە خوالێ‌خۆشبوو مامۆستا مەلا سەی حسەن واژی ماوەتەوە یەکێ بووە لە خۆشەویستانی ئەو مامۆستایە. لەپاش تەواو کردنی خوێندن گەڕاوەتەوە بۆ شاری پێنجوێن وە لە خزمەت زانای گەورە مامۆستا مەلا عارف، مودەریسی مزگەوتی پاشای پێنجوێن ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و لە مزگەوتی باوکی (مزگەوتی قازی) بوەتە مودەریس و پێش‌نوێژ وە لە ساڵی ١٩٥٩ز بۆ ماوەی دوو ساڵ لە شاری سنە و مەریوان ماوەتەوە و دواجار گەراوەتەوە شاری پێنجوێن و تا ساڵی ١٩٦٥ز لە پێنجوێن ماوەتەوە دواجار رووی کردوەتە شاری سلێمانی و لە مزگەوتی (سەید ئەحمەدی نەقیب) بووە بە پێش‌نوێژ و کاتەکانی بە خواناسی و ئامۆژگاری و نوسین و هەڵبەست بەسەر بردووە.

ئەم زانا گەورەیە پەیوەندی بە تەسەوفەوە بووە و لە خزمەت شێخ عەلائەدینی بیارە تەمەسوکی بە تەریقەی نەقشبەندی کردووە و لە پاش لە دنیا دەرچونی شێخ عەلائەدین تەمەسوکی کردووە بە حەزرەتی شیخ عوسمان وە سۆزێکی تایبەتی بۆ ئەم مورشیدەی هەبوە.

دوای تەمەنێکی بە بەرەکەت، لە شەوی هەینی ١٢ئابی ١٩٨٣زایینی بەرانبەر بە ٤ذی‌القعیدەی ساڵی١٤٠٣ ۆچی لە شاری سلێمانی گیانی پاکی بە پەروەردگار سپارد و لە گۆرستانی گردی سەیوان لە پەنای گۆری شێخ مەعروفی نۆدێدا سەری نایەوە.



## حەمد و سەنا

سەنا و ستایش بە بێ ژمارە
هەر لە بۆ خودای پەروەردگارە
خالقی ئەجرام عولوی و سوفلیە
گیان بەخشی حەیوان وەحشی و ئەهلیە
نەزم ئارای بینای قەسری عالەمە
نوری شعوردەر بەنی ئادەمە
نەموحتاج بەکەس نە بە خورد و خەو
عالەم سەراسەر موحتاجن بە ئەو
دائیرەی ئیمکان لە حەوزەیایە
زەمامی زەمان لە قەبزەیایە
دەریای سەلات و سەلامی بێ پەی
شەپۆل دا بۆ سەر موستەفا پەی پەی
بەری لە جەزری نەقس و نیهایەت
مەددی بۆ ئەبەد بکا سیرایەت
تیر ئاوکا باغی فەزل و مەعالی
سەروی ئەسحاب و نەهالی[1] ئالی

[1] – نەمام

دابگـــرێ چـــەمـــەن فیرقـــەی تـــابیعین
(رضــــــی الله عــــــنهم اجمعـــــین)

**دانانی بە هۆی قسەی رەخنەگران لە پێشینیان کە هەر ئایین پەروەر بوون**

چــوم لــە (صــیدلی)[1] ئایــاتی کــەونــی
دەرم هێــنا چــەن شوشــەی پــڕ مــەعنــی
یــانێ ئــەدویــەی (ادلّــە)ی مــەعقــول
کـە هـۆی شـیفا بـن بـۆ دەردی مـەعلـول
بــەهــۆی تــەرەقــی پیشــە و (صــنایع)
پــەیــدا بــوونی چــەنــد شــتی(بــدایع)[2]
گـــۆڕانی وەزع و دەســـتوری تـــازە
ئــایینی ئیســلام ئیمــڕۆ بــێ نــازە
غــەرەز لــە ژیــان دنیایــە تــەنهــا
(معــاد)[3] ناویشـــی هاتـــە ئینتیهــا
بــە تێــکەڵ بــونی بێــگانە (بالکــل)
بینــای حــوکمی شــەرع کــەوتــە (تزلــزل)

---

[1] – دەرمان خانە(داروخانە)
[2] – جەمعی (بدیع)ە یانی تازە
[3] – قیامەت

بە پەتی تەقلید تـون تـون لـەم عـەسـرا
وەک ئەسیر هـەر دوو باڵـی دیـن بـەسـرا
حـەتتـا زۆر کـەسـی بـاوک مـوسڵـمان
دڵ چۆڵـن ئێسـتە لـە نـووری ئیمـان
وا وێڵـن لـە ڕێـی مـەزهـەب و ئـایین
بێ ئـەدەب لـە گـەل (عنعنـاتی)[١] دیـن
ئـەگـەر بتناسـن بـە شـەخسێ دینـی
لـە ڕویـان گـرژی کینـە ئـەبینـی
وە یـا بـزانن کـەسێ بـەو داوە
پێـی پێـوە نـەبـوە دڵ سـادە مـاوە
دەوری لـێ ئـەدەن لـە هـەمـوو لاوە
ئـەڵێـن دڵسـۆزین تـۆش وەرە نـاوە
بە چەشـتەی قسـەی حـەقیقـەت بـەتـاڵ
ورد ورد ئەی کێشـن بـۆ تـەڵـەی(ضلال)
ئـەڵێـن گـۆڕانی ئـەم ئـەوزاعاتـە
ئـەم هـەمـوو (فـن) و (اختراعـات)[٢]ە
وەک (زەرر) ە و (صارخ) تـەیـارە و رادیـۆ
بـەرق و لاسـلکی[٣] یـا (تـەلـەفزیـۆ)

---

[١] – ئاماژەیە بۆ فەرمودەکانی پێغەمبەر کە بەشێکی بە فەرموودەی (مُعنعن) ناسراوە.

[٢] – جمعی (اختراع)ە یعنی داهێنراو

[٣] – بێ سیم ؛ بێ وایەر

ئـــەمانـــە و بـــاقی (صـــنایع) هـــەمـــوو
لـــە پێـــش ئێـــمەوە وجودیـــان نـــەبـــوو
دیـــارە پێشـــینان پڕقســـور بـــوو ون
کـە لـە زانینـی سـەنعـەت دوور بـوو ون
دائـــم خـــەریکـی بـــەرزی ئـــایین بـــوون
بۆیـە لـە عیلمـا پـەسـت و پـایین بـوون
چونکە دین نەیهێشـت زانسـت سـەرکـەوێ
کـــەوابـــوو ئێـــمەیـــش بـــا نـــەمانـــەوێ
بـەم چـەشـتە کـەوا لـە لایـان شـەکـرە
ئـــەممـــا حـــەقیقـــەت ئامێـــتەی زەهـــرە
لە پیاڵەی تەقریر وای پـێ نـۆش ئـەکـەن
ئەویش بە بوغزی دین نەخـۆش ئـەخـەن
بـــە جۆرێـــکی وا ڕۆ چـــوون لـــەمـــا
کـــەڕن لـــە ئیلقـــای[1] وەعـــزی عولـــەمـــا
لـــە دەوای دەلیـــل (مَنقـــول) مـــەلـــولن
موحتـاجی حـەببـی (حُجّـە)ی (معقـول)ن
بـەکۆمـەکـی خـوای تـەوانـای تـەنیـا
بـــە ئیمـــداداتی ڕۆحـــی ئـــەولیـــا

---

[1] – وەرگرتن

چــوم لـــە (صــیدلی) ئایـــاتی کـــەونـــی
دەرم هێــنا چــەن شیشــەی پــڕ مــەعنــی
یـــانێ ئـــەدویـــەی ئـــەدیللـــەی (معقـــول)
کـــە هـــۆی شـــیفا بـــن بـــۆ دەردی (معلـــول)
بـــەڵام (أطبّـــا)ئـــەڵێـــن پێـــش دەوا
لازمـــە نـــەخـــۆش (مُســـهل)ێ بخـــوا
تادڵـــیش نـــەکـــرێ لـــە شـــک (تنقیـــە)[1]
دەرمـــانی (بُرهـــان) فائیـــدەی نییـــە
دوایـــی بـــە دەرزی دەلایـــل ئـــاوی
حـــوبی دیـــن ئـــەشـــێ بچێـــتە نـــاوی

**پێشەکی**

چگـــم لـــە ئـــەخبـــار خـــارجی و ســـادق
ســـەبـــەب زانســـت بـــە حـــوکمی خـــالق
دوو حاســـەی بینش[2] هـــەیـــە بـــۆ بـــەشـــەر
یەکـــەم لـــە لـــە ســـینە دووەمیـــان لـــە ســـەر
حاســـەی بینشـــی ســـەر نـــاوی چـــاوە
ئـــەمیتـــر یـــا دڵ یـــا عـــەقڵـــی نـــاوە

---

[1] - پاک
[2] - زانین

بەشی چاو تەنها چشتی (حس)ی یە
دڵ مەعقولات و ئەمری قودسی‌یە
غەڵەت نابینێ قەت چاوی سینە
بەڵام چاوی سەر زۆر غەڵەت بینە
مەسەلا چاوت ئەڵێ ئەستێرە
کەمترە جورمی لە یەک کولێرە
عەقڵ ئەڵێ نەخێر ئەستێرە بەرزن
زۆریان گەورەتر لە حەجمی ئەرزن
یا لە هەتاوا بتەوێ وەختێ
تاوێ بچێتە سایەی درەختێ
بە سێبەرەکە ئەڵێی وەستاوە
چاوت نابینێ بچێ بەولاوە
بەڵام چاوی دڵ ئەڵێ ئەوسایە
تاو لە گەل تاودا لە رۆیین‌دایە
یا ئەوەی کەوا وا لە قەتارا
ئەبینی وەستاو گشت وا لە غارا
وەیا خود انسان کەژو کێو لە ئاو
بە عەینی خۆیان ئەبینی بە چاو
دڵ ئەڵێ هەر دوو غەڵەتی چاوە
ئەمیانە عەکسە ئەویش وەستاوە

چەند شتێ تریش کە نەوتراوە
عەقڵ بۆ زانین چاو ساقی چاوە
کەوابوو ئیتر تۆ کە ئینسانی
پێویستە ئەوە بە دڵ بزانی
عالەم ئاوێنەی باڵا نومایە
هەر وەک نەزەر لەو فیکریش لە مایە
گەر لادەی پەردەی غەفڵەت لە سەری
رێک دڵت بگری لە بەرابەری
لەو ئاوێنەدا تۆ بە یەقینی
(صانع)ی (قدیر) بە دڵ ئەبینی
فەرمویە حەزرەت (علیه السلام)
بیر مەکەنەوە لە خوای عەلام
بەلام فەرمویە (تفکر) لە خەلق
بکەن بۆ ناسین خەلاقی (مطلق)
وایە؛ چوون بە بێ واسیتە نەزەر
لە رۆژ، نوری چاو ئەدا بە هەدەر
بەلام گەر نەزەر لە تەشتێ ئاوا
لە رۆژ کەی زەرەر ناکەی لە چاوا
هەروا (تفکر) لە زاتی یەزدان
عەقڵ گێژ ئەکا و عاقڵ سەرگەردان

به بێ واسیتەی نەزەر لە(مصنوع)
فکر لە (صانع) ئەمرێکە مەمنوع

## بیرێک لە سەرە تای دروست بوون[1]

رۆژێ سەعاتێ بەر لە مردنت
بەر لە دەمی خاک بەسەر کردنت
برۆ لە جێیەک بێ دەنگ و سروە
پارچەی ئەفکاری موفید بدروە
تێفکرە یەک یەک هەر لە نەفسی خۆت
لە وەحشی سەحرا تا حەیوانی دۆت
لە دار و لە بەرد لە ئاو لە هەوا
لە ئاسمان و ئەوەی وا لەوا
گەر شوشەی عەقڵ و شعور نەرێژی
شەربەتی شەهدی ئیمان ئەچێژی
لە نەفسی خۆتۆ برۆ بەرەوژوور
شەریف لە ڕەشید ڕەشید لە غەفور
ئەم(تسلسل)ە زۆری پێ ناوێ
هەموو ئەچنەوە سەر ژن و پیاوێ

[1] – ئەم دوو بەیتە بە خەتێکی جیاواز لە سەرەتای ئەم شێعرانەدا نووسراون:
سەفەری ئایات ئەخاتۆ بیرت ××× بیر لە ئافاق و نەفس تەدبیرت
ئێستە با بیرێ لە نەفسۆ بکەین ××× بە بیر لە نەفسا بە خودا ئەگەین

هـــەر وەهـــا وەحشـــی و حـــەیوانـــاتی دێ
بـــە نێـــر و مـــێ‌یـــە نیهایـــەتیـــان دێ
ســـەبـەبـــی چـــی بـــوو لـــە یـــەک مـــەکانـــا
دوو دوو دروســـت بـــوون لـــە یـــەک زەمانـــا
پێـــم بلـــێ بـــۆچی وەکـــو یـــەکـــەم جـــار
جگـــە لـــە دوو دووی زووبـــە (اســـتمرار)
ئـــەم ئـــەرزە نـــەبـــو بـــە کارگـــای ئیجـــاد
بـــۆ نـــەوعـــی حـــەیـــوان یـــا ئـــادەمـــی‌زاد
ئـــەو بـــۆ زوو نـــەبـــو ئـــەمـــی‌تـــری دێـــر
ئـــەمـــە بـــۆ مـــێ بـــوو ئـــەوی تـــری نێـــر
بـــۆ پـــەیـــدا نـــەبـــو ئـــەمیـــان لـــە تورکـــا
ئـــەویـــان لـــە نـــرویج یـــا لـــە دانمارکـــا
لـــەو بـــەینـــا بـــۆچی هیچیـــان نـــەمـــردن
مانـــــەوە لـــــە بـــــۆ (تناســـــل)کـــــردن
ئـــەنـــواعی حـــەیـــوان دوو دوو یـــەک بگـــرێ
ئەندامیان هەر وەک یـــەک دروســـت بکـــرێ
لوت هەر وەکـــو لـــوت دەم بـــە وێـــنەی دەم
دەست و پێ وەک یەک بە بێ زیـــاد و کـــەم
گوێ هەر عەینی گوێ سەر بە میسلی‌ســـەر
ئەعـــزای دەرونـــیش هـــەمـــوو وەک هـــی‌دەر

هەر لە یەک (عضوا) فەرقیان خراوە
نێری بەو ؛ مێیی بەمیان دراوە
ئەویش بۆ (صلاح) یانی زاوو زێ
ئەمە بوو بە نێر ئەویتر بە مێ
جا گوایە ئیتر لەلاتۆ کەمە
کە ئەمە خەلقی خوای عالەمە

## بیرێ لە سودەکانی زەوی

ئینجا ئەم خاکە کەوای لە سەری
بروانە لە بۆ سود و سەمەری
ئەوەی پێویستە بۆ وەزعی بەشەر
لە نەوت و لە خوێ لە زیو و لە زەڕ
لە (فلزیات) هەر چیت پێ ئەوێ
تێیدا مەوجودە پەکت ناکەوێ
هەڵ قوڵێنی ئاو لەو بن بەردانە
هاژە هاژی لەو شیوو هەردانە
پاش بەینێ کە دێ یەک ئەگرێ و ئەروات
ئەبێ بە (شط)ێ وەک دجلە و فرات
هەر لە ئیبتدای خەلقی دنیاوە
ئەروات و پۆنگی نەهاتە دواوە

یـا ئــەوە ئـەروا و مــەحــو ئـە بێــتەوە
یــا عـــەینـــی ئـــەوە دیســـان دێـــتەوە
هـــەر کامێـــکی بـــێ تـــەرتیـــبێ وایـــە
تــەدبیــری تــەنهــا لایــەق بــە خوایــە
خـــاک لـــە زەڕ و زیـــو زیـــو و زەڕتـــرە
چـون ئـەم بـە پیـت و خـاوەن فـەڕتـرە
(عنصـــر)ی زەوی گـــەر خـــاک نـــەبوایـــە
وا نـــەرم و بـــە ئـــاو نمنـــاک نـــەبوایـــە
تـــەلا بوایـــە یـــا مـــس یـــا ئاســـن
بـــێ کـەڵـک ئـەمـاوە گـا جـوت و گاسـن
ئـەم(محصـولات)ە لـەم دەشـت و شـاخە
ئـەم هـەمـوو میـوەی بێسـتان و باخـە
بـە ئـاوی بـاران یـا خـود بـە کانیـاو
هـەر یـەک بـە وەختێ بۆمـان دێـتە نـاو
بـەهـۆی ئـەوەیـە کـە زەوی خاکـە
کـەوابـــوو ئیتـــر بزانـــە کاکـــە
ئـــەم تـــەدبیـــر و تـــەرتیبـــە عالـــە
دەســـتوری خـــوای ساحێـــب جـــەلالـــە

## بیریَ لە سودی ئیجادی هەور و هەوا

ئـــەم هـــەوا کـــەوا پـــاک و لـــەتیفـــە
لابـــەری بـــۆن پـــیس و کـــەسـیفە
لـــە هـــەمـــو شـــتێ پێـــی موحتـــاج تـــری
ئـــەو نـــەبـــێ بـــە ســـێ دەقیقـــە ئـــەمـــری[1]
بۆ ســـەوزی و درەخـــت (طیـــور) و حـــەیـــوان
ســـەبـــەبـــە لـــە بـــۆ نـــەشـــئو نومایـــان
(ســـائق)ی هـــــەورە بـــــۆ ئـــــەو جێـــیانە
کـــــەوا موحتـــــاجی ئـــــاوی بارانـــــە
کـــەوا بـــوو هـــەوریـــش هـــەوای پـــێ ئـــەوێ
کـــوێ وشـــک و دێـــمە روی بکـــا لـــەوێ
هـــەر وەکـــو ئـــەڵێـــن هـــەور(مکهربـــە)
نـــەوعێـــکی (ســـالب)نـــەوعـــێ(موجبـــە)
هـــــەردوو لـــــە یـــــەکتـــــر (متنـــــافرن)
بـــێ شـــک لـــە خـــۆوە قـــەت یـــەک نـــاگرن
هێـــزی بـــا لـــە گشـــت لاوە پیـــا ئـــەگـــا
(تلقـــیح)ی (موجـــب) لـــە (ســـالب) ئـــەکـــا
موئـــەیـــدە بـــۆ ئـــەمـــە وازیحـــە
(أرســـــــلنا الريـــــاح لـــــــواقح)ە

[1] – (بە حەسەب عادەت ئەو نەبێ ئەمری) نسخە

لــە دەریــای هــەوا ئــەکــەونــە مــەلــە
ئــەگــەر (طیــار)ە وە یــا خــود مــەلــە
هــۆی گــەیشــتنی دەنگــە لــە بــۆ گــوێ
چ نزیـــک بـــە دەم چ دوور بـــە رادوێ
کـــێ بـــوو بـــزانێ بـــەغـــەیـــری خـــوا
کـــە بـــۆ ئـــەمانـــە پێویســـتە هـــەوا
حـــەرەکـــات هیچـــی بـــێ هـــەوا نـــابێ
هـــەواش بـــە خـــودا بـــێ خـــودا نـــابێ
ئـــەســـباب بـــە پلـــەی ئیمـــان بزانـــە
بـــەوە (مســـبب) تـــەنهـــا یـــەزدانـــە

**بەیانی کەمێ لە سودەکانی رۆژ**

وا فـــەڕشـــی خاکـــت بـــاش بـــۆ داخـــرا
ئـــەوەی پێویســـتە بـــۆت دروســـت کـــرا
بـــەڵام چـــی ئـــەکـــەی تـــۆ بـــە تـــاریکی
مـــەعلـــوم موحتـــاجی (الکتریـــک)ی
جـــا لـــەگـــەڵ عیبـــرەت ســـەرت هـــەڵـــبڕە
پـــەردەی ئـــەفکـــاری ژینـــت دادڕە
بڕوانـــە بـــۆ ئـــەم گڵـــۆپە جوانـــە
دوور و نزیکـــی لـــەلا یـــەکســـانە

نە موحتاج بە ڕۆن نە بە بەنزینە
دایم کار ئەکا بە بێ مەکینە
نە دوکەڵ ئەگرێ پاک بکرێتەوە
نە هەرگیز ئەشکێ چاک بکرێتەوە
نە ئەوندە نزیک کە کەس ببرژێ
نە هەندەش دوورە سەرما بیکوژێ
هۆی وشکۆبوونە بۆ (مرطبات)
زیاد لە ئەندازەی حیوان و (نبات)
(فصول)ی ساڵ و ڕۆژ شەو هەر دوو
لە حەرەکەی ئەو تەولدیان بوو
لە وەزعی ڕۆژ و شەو لە ئینتیقال
پەیدا بو بۆمان هەر چوار فەسڵی ساڵ
هەموو نیزامێ نەما تا ژیان
چاندنی توو و دار و درەختان
پشکوتنی گوڵ تەقینی کانی
ڕوانی دەغڵ و بەرهەم هێنانی
چەند سودی تریش کە بێ ژمارەن
بەهۆی گەردش و سوڕی ئەم چوارەن
بڵێ بەو کەسە ئەڵێ ئەم ئەرزە
(منفصل) بووە لەو ڕۆژە بەرزە

پـــاش کوژانـــەوە لـــە(اســـتنقاع)ی
بـــە(تطـــور)ی خـــالّ و ئـــەوزاعـــی
پـــەیـــدا بـــووە ئـــەم شـــەت و دەریایـــە
ئـــەم حـــەیوانـــات و درەخـــت و گیایـــە
ئـەگـەر لـە خـواوەپێـت وایـە ئـەڵـبەت
(فتقناهمـــا)[1]ت کـــردوە بـــە (حجّـــت)
وەر لــــە خۆتـــەوە وەهمـــت وا جـــووە
یـــا لـــە پێشـــینان وەهـــات بیســـتوە
وەهمـــی پـــەتیـــارەت پـــەتـــی چـــڕیوە
ئـەسڵێشـت کـەونـی هـەر وەهـا دیـوە
ئـەی رۆژ ئـەی هـەوا و (اجـرام)ی گـران
کەی بون لە چیی بوون چـۆن دروسـت کـران؟
ئـــەم رۆژە یـــەکجـــار زۆرە(خـــواص)ی
کـــەمێـــکی نـــەبـــێ بـــاقی ناناســـی
دەرەجـــەی گـــەرمـــی وایـــە تـــەئسـیرکا
کـــەمـــێ لـــە ئـــاوی دەریـــا (تبخیـــر) کـــا
هـــەوا ســـەری خـــاو کـــۆی بکاتـــەوە
دیســـان بـــە ئـــاویی رۆی بکاتـــەوە

[1] – ئامازەیە بە ئایەتی ٣٠ سورەتی الانبیاء

بەسەر کەژ و کێو شیوو زەوی و زار
بۆ ژینی دەغڵ و درەخت و گوڵزار
جا بروانە بۆ ئەم هەموو سودە
کە لە(مفاز)ەی (کون)ا مەوجودە
گەرمی بە رۆژ دان ئاو(تبخیر)کردن
بە هێزی هەوا تەم و مژ بردن
کۆببێتەوە و سەر کەوێ بە تاو
بۆ چینی سەردی هەم ببێ بە ئاو
کۆ کردنەوەی و سەرخستنی بۆ
تەبەقەی سەردی و بە ئاو ببێتۆ
بێتەوە بۆ ئەرز لە چینی بەرزی
بە نەرمی و وردی لە گەل (تجزّی)
ساراو شیوو کەژ بە گوڵ نەخشین کا
هۆی ژینی چین چین رۆحلەبەر شین کا
هەر یەک لە جێی خۆی ئەدا شەهادە
لە سەر خالیقی ساحێب ئیرادە
کە ئەم نیزامە پڕ لە حیکمەتە
دەرچوی کارخانەی عیلم و قودرەتە

## هیلال و میسال

هــیلال کــە کاتــت بــۆ حیســاب ئــەکــا
جگــەری مادیــت بــۆ کــەبــاب ئــەکــا
بــە پێــی تقابــل رۆژ بــە جــوزئی مانــگ
تا چواردە نوری زیـاد ئـەکـا شـەش دانـگ
دووبــارە(مُحــاق)ە زەعفــی پــێ دێــنێ
لـە سـیدا نـووری گشـت لـێ ئـەسێـنێ
ئـەمـیش حیسـابی مانـگ و سـاڵ ئـەکـا
لـە ژەنگـی خـەیـاڵ دڵ بـێ خـاڵ ئـەکـا
وەک هێــــزی(تجفیــــف) بـــــە رۆژ دراوە
مــانگیش بــە (تَرطیــب)(تَوظیــف) کــراوە
(حُجــة الإســلام) شێـــــخی غـــــەزالـــــی
رەحمــەت لــە خــۆی و ئــەهــل و عــەیــالی
کە سەرپاک ئـەهلـی فـەنـی(فـەلسـەفـە)
بــە عـــیلم و فــەزلــی ئــەو (مُعتــرِف)ە
فــەرمویــە: ئـەو گشـت ئـەستێـرە بـەرزە
هەر یەک وان لە سەر شکڵـی ئـەم ئـەرزە
بـەعزێـکی بچـوک بـەعــزێ گــەورەیــە
لـــە رەنگیشـــیانا تـــەفـــاوت هـــەیـــە
ئـەمـە لـەو نزیـک یـا ئـەو لـەم دوورە
(اقتضــــای)حیکمـــــەت بـــــەوە زەرورە

جا هەر کەس تـەمـی (إغـوای) شـەیتـانی
دانــەگــرێ نــووری چــرای ئیمــانی
ئـەزانــێ کـە ئـەم نـەزمـە غـەریبـە
بینـای ئـەم قـەسـرە ئابـەم تـەرتیبـە
چـۆن لـە خۆیـەوە وا پـەیـدا ئـەبـێ
عـاقڵ لـە قسـەی وا شـەیـدا ئـەبـێ
لـەو شێـتە پرسـە کـە وا لـە هـەردا
خـاکی بـێ هۆشـی ئـەکـا بـەسـەردا
بڵــێ ئــەو بینــا کــەوا دیــارە
بــێ دەس لێـدانی وەسـتا و میعمــارە
وە یــا لـە بـەرمـا ئـەم پارچـە کـەوا
بـێ وەسـتا تـەنـرا بـێ خـەیـات دروا
بزانــە چلــۆن شــان کــا بــە چێــوا
خرابتــر لــە خــۆی بتکــا بــە کێــوا
گسـکی ئـەم بیـرە بـۆ شـەخسـی عـاقڵ
خـەوش و خاڵـی غـەش ئـەماڵـێ لـە دڵ
ئـەوەش بـە(مـاذی) و (الحـاد) مـەوسـوفە
بـە چـاو ئـەوەوە شێـت فـەیلـەسـوفە
مەعلومـە لـەلای گشـت ئـەهلـی عیرفـان
کـەون قـەسرێـکە زۆر درێـژە و پـان

سـەقفـی ئاسـمان جـوان و رازاوە
مانـگ و رۆژی پیـا هـەڵواسـراوە
بـە ئـەستێـرەی گـەش زینـەت دراوە
هـەر یـەک چـەنـد ئیشـی پـێ سپێـرراوە
زەمینـە فـەرشـی ئـەم قـەسـرە گـەورە
بـە نیعمـەتـی زۆر دراوە دەورە
هەور و رەعـد و بـەرق لـە بـۆ ئـاو رشێـن
سـروەی شـەماڵـیش پانکـە و بـاوەشێـن
فریشـتەی خـودای ئـەهلـی ئـەم بینـا
چ لـە ئاسـمان چ لـە زەمینـا
(تصـرف) ئـەکـەن لـە خـوارو لـە ژور
ئـەم فریشـتانە بـەگوێـرەی دەسـتوور
خـاوەنـی ماڵـیش حـەق تـەعالایـە
ئاگـای لـە ئـەهلـی پـەسـت و بالآیـە
لای بـەعـزێ فـەهمـی ئـەمـە گرانـە
چـون فکـری گێـژی چـەرخـی ژیانـە
میسـالی ئـەمـە وەک ماڵێـکی عـال
پـڕ لـە ئـەسـاس و تفـاق و عیـال
لـەو ماڵـەدا بـێ دوو شـارە مێـرو
تـەسـادف بکـەن بـە یـەکتـری دوو

لە ئەوزاعی یەک بکەونە پرسین
ئەحواڵتان چۆنە تێرن یا برسین
بەغەیری وەزعی ژیانی خۆیان
مەوزوعێکی تر نابیسی لێیان
ئیتر نازانن کە ئەمە ماڵە
پڕ لە ئەساس و ئەهل و منالە
بێ عیلم و خەبەر لە وەزع و ئەحواڵ
نەماڵ ئەناسن نەساحێبی ماڵ
ئێمەش هەر ئەونە لەمە ئەزانین
دیارە وەک مێرو بەستە زوبانین
ئەمما چون مێرو یا باقی حەیوان
دووربینی عەقڵ نەدراوە پێیان
کەس نیسبەت بەوان ناکا تەسەوور
قابل بن لە بۆ بیر و تەفەککر
بەڵام خۆ ئیمە وەکو ئەوان نین
لە کەونا ئەگەر تووی بیر بچێنین
لە مەزرەعەی بیر هەڵ ئەگرین خەرمان
دەغڵی عیبرەت و برنجی عیرفان
خودا بە چاکە کەسێک وەسف ئەکا
کەبیر لە سەماو زەوی(صَرف)ئەکا

بڵـــێ ئاســـمان هـــەر ئـــەوە نییـــە
بڵێـــی ئـــەبیـــنم شـــینی و پانییـــە
چـــونیش ئـــەو گشـــت شـــینی و پانییـــە
ئـــەبیـــنێ و لایـــق مـــەدحـــی خـــوا نییـــە
(مُجمـــلا) بیـــرێ لـــە خـــەلقـــی ئـــەعـــزات
بکە بە سەر مـەشـق بـۆ ئـەرز و سـەمـات

## بیرێ بە کورتی لە ئەندامی لەش

بزانـــە ئـــەسڵـــت نـــەختێ مـــەنـــی بـــوو
چڵـــمە لـــەتـــەیـــە خـــوار و دەنـــی بـــوو
گـــەر تـــۆزێ لـــە ســـەر زەویـــت دانایـــە
ئـــەبـــو بـــە تـــۆزێ تـــۆزی بـــێ مایـــە
ئـــەوجـــار بـــۆ ئـــەوە کـــە پـــەروەردە بـــێ
خـــوا حـــوببی خســـتە بـــەینـــی نێـــر و مـــێ
لـــە وەختـــی(وِقـــاع) ئیجـــرای پـــێ ئـــەکـــات
تا لە مـــێ بـــە جێـــی مـــەخسوســـی ئـــەگـــات
ئـــەم نوتفـــە ســـپیە لـــە پاشـــی بـــەیـــنێ
ســـوور ئـــەبـــێ ئـــەبـــێ بـــە پارچـــە خوێـــنێ
دووبارە ئەویـــش لـــە پـــاش چـــەنـــد زەمـــان
گۆشـــت پـــارە ئـــەکـــا ئـــەبـــێ بـــە ئێســـقان

سەیری ئەم نەختە نوتفە ئاوی‌یە
کە ئەجزای هەموو متساوی‌یە
چۆن ئەبێ بە خوێن بە رەگ و ئەعساب
بە گۆشت و بە ئێسک بە وردە ئەسباب
ئەندامی دەرت وەک (تدویر)ی سەر
لێجیا بونەوەی چاوت بۆ نەزەر
وە یا (مَنافذ)دەم و لوت و گوێ
(محلی) (خروج) ئیتر چیت ئەوێ
(تَمدید)ی دەست و نینۆک و پەنجە
وەک ئەعزای بەدەن کە یەکەم گەنجە
گەر بەدەن دارای جمگە نەدەبو
محاڵ بو لە بۆ بەشەر هاتوچو
(صانع) ئەی زانی تۆ بە هاتوچو
موحتاجی بۆیە عیلاجی فەرموو
دەرونیش جەرگ و سی و میعدە و دڵ
مەسانە و زرا و ریخۆڵە و سپڵ
ئەم ئەندامانەش کە ناو براون
بە چەند ئەجزایە تەقسیم کراون
مەسەلا کە چاو حەوت تەبەقەیە
هەر یەک وەسفێکی مەخسوسی هەیە

یەکێک لەم حەوتە ئەگەر نەمێنێ
ئەو چاوە ئیتر کوێرە نابینێ
وەرە سەر سەیری ئەم گشت ئێسقانە
لەو نوتفەوە ئەو ئێسکە ڕەقانە
دارای ئیختیلاف شکڵ و (مقادر)
بەعزێکی درێژ بەعزێ(مستدر)
پتەو و کلۆر باریک بەعزێ پان
بە گوێرەی حاجەت حەرەکەی ئینسان
وەتەر[1] یانێ ژێ سەری (مفصل)ی
پێکۆ بەستووە بە(مُکمل)ی
سەریش لە پەنجا و پێنج پارچە ئێسقان
شکڵ و میقداریان لە یەکتری جیان
شکڵی (کُرَوی) لێ هەڵخراوە
شەشیان بۆ کەللە (تخصیص) کراوە
چواردەیان لە بۆ شەویلەی سەرو و
دووی‌تریان عاید شەویلەی خوارو و
باقیش عیبارەت لە خرێ و لە دان
لەوانیش بڕێ تیژ و بڕێ پان

---

[1] – لە خەتەکەدا (ئەوتار) نوسرا بوو

ئـــەو قیســـمە تیـــژن لـــە بـــۆ بـــڕینن
بـــاقیش بـــۆ چشـــتی (غلـــیظ)هـــاڕینن
(مرکـــب)ە مـــل لـــە حـــەوت مورۆلـــە
یـــانی خـــەرەزە گـــەورە و بچکۆلـــە
بـە میقـدار لـە گـەڵ یـەک موختـەلـیفن
ئـــەمما (مســـتدیر) دارای(تجـــویفن)
لـە گـەردنـەوە تـا ئێسـکی(عـەجـەز)
لـە پشـتا هـەیـە بیسـت و چـوار خـەرەز
(عـەجـەز) سێ ئێسـکی پێـوە (مختص)ە
هـــەرە خوارویـــان نـــاوی(عصـــعص)ە
(عصعص)یـش بـە سێ جوزئـا(مقسـوم)ە
لـە عیلمـی (طـب)ا هـەمـووی مـەعلومـە
مـەتڵـەب ژمـارەی ئێسـک و رەگ نیـە
غـەرەز مـەعریفـەت بـە[1](مکـون)ی یـە
(فـــنّ)ی (تشـــریح) و عیلمـــی(أطبـــا)
نـاوی هـەمویـان بـە تـەفسیل ئـەبـا
بـەڵام نـەزەریـان هـەر بـۆ عیلاجـە
بـزانن نـەخـۆش بـە چـی موحتاجـە

[1] - وادەردەکەوێ «بە» زیادە بێ

بـــەمـــە (اســـتدلال) ئـــەکـــەن (اکـــابر)
لـــە ســـەر کـــەماڵـــی قـــودرەتـــی (قـــادر)
زۆرە فـــەرقـــی بـــەیـــن ئـــەم دوو تـــەماشـــا
نیســـبەتیـــان لـــەگـــەل یـــەک نییـــە حاشـــا
ئـــەو بـــۆ نـــەخـــۆش و ئـــەم بـــۆ ئیســـتیدلال
لـــە ســـەر گـــەورەیـــی خـــودای (ذوالجـــلال)
چـــی هـــەیـــە وەک مـــس یـــا ئاســـن قـــایم
ساڵێـــک لـــە ســـەر یـــەک کـــار بکـــا دایـــم
بـــێ شـــک ئـــەبینـــی یـــا تـــەنـــک ئـــەبـــێ
یـــا ئـــەرزێ و ئـــەپـــوێ و بـــێ بنـــک ئـــەبـــێ
جـــا تـــەماشـــاکە بـــە مـــوددەی ژیـــان
زوان هـــەڵ ئـــەســـورێ و نایـــەنـــێ زیـــان
وەیـــا مـــەعیـــدە بـــەو خـــەفیفیـــە
ســـەد ســـاڵ کـــار ئـــەکـــا دڕانـــی نیـــە
وە یـــا میـــزەڵان ئـــەویـــش هـــەر وەهـــا
ئـــیش ئـــەکـــا تـــا ژیـــن دێـــتە ئینتیهـــا
بـــۆ بـــەشـــەر فکـــرێ وا ئـــەبـــێ بـــەهـــۆی
قـــووەتـــی یـــەقـــین بـــە خـــالقی خـــۆی
لـــە بـــۆ تـــەحریکـــی ئێســـقانیش دیســـان
خـــەلقـــی فـــەرمـــووە خـــودا بـــۆ ئینســـان

چەند (عَضُل)ە یەک مەجموعی ئەمە
لە پێنجسەد و سی یەکێکی کەمە
لەو (عضلات)ە بیست و چوار تەواو
موحەرریکە بۆ برژانگ و بۆچاو
ئەگەر ناقیس بێ یەکێک لەوانە
ئەو چاوە ئیتر بە کز بزانە
هەروا هەر عوزوێ بە چەند (عضلات)
تەقیید کراوە لە بۆ حەرەکات
باسی(ورید) و ڕەگ و(شَریان)
لە گەل ئەعسابا گەر بکرێ بەیان
ئەبێ کتێبێ تەشریح بهێنی
یەکە یەکەیان بە دەرس بخوێنی
ئەمما مەجالی هەیە کە بڕوا
(تفکر)بە هەر ئەعزایە لەوا
خوا ئەمانەی لە یەک قەترە ئاو
بە ڕەحمەتی خۆی هێناوەتە ناو
پشتی ئەساسە لە بۆ بەدەنی
سکی بۆ (ئالات) غەزا و خواردەنی
سەری جامێعی هەموو حەواسە
دارای تەبەقات شکڵ و ئەساسە

لــە دەنکــە نیســکێ لــە ڕەشــایی چــاو
(مـــنعکس)ئـــەبـــێ ئاســـمان تـــەواو
پێڵـــو بـــۆ (ســـیقل) گـــەردی هـــەوایـــی
برژانـــگ بـــۆ جـــەمعـــی نـــووری بینـــایی
چـــون وەک ســـپیەتـــی نـــوور بـــڵاو ئـــەکـــا
ڕەشـــایش جـــەمعـــی نـــووری چـــاو ئـــەکـــا
(تودیـــع) بـــەو بـــووە قـــووەی (بـــاصرە)
عـــەکســـی ئـــەجســـامی تێـــدا زاهـــرە
هێـــزی (ســـامعە)یـــش بـــە گـــوێ دراوە
دەنـــگ ڕائـــەکێشـــێ لـــە ڕووی هـــەواوە
بـــە دیـــواری بـــەڵـــگ دەورە دراوە
خـــەفیـــف و تـــەنـــک دروســـت کـــراوە
نـــە نـــەرمـــە نـــە ڕەق بـــە جۆرێـــکی وا
ئـــەگـــەر دەعبایـــەک بـــە ســـەریـــا بـــڕوا
کـــــڕە و دەنگێـــکی وایـــە لێـــوە دێ
گـــەر نوستبێـــتیش زوو بـــە خـــەبـــەر دێ
دووبـــارە دەنگـــیش کـــۆ ئـــەکاتـــەوە
تـــا بـــاش لـــە کـــڕناخ دەنـــگ بداتـــەوە
کـــردەوەی خـــودا پـــڕە لـــە حیکمـــەت
ئاوێـــکی تاڵـــی بـــە مـــەحـــزی ڕەحمـــەت

دانــاوه لــه نــاو گوێــی ئــەم بــەشــەره
بــۆ دەفعــی هــەوام[١] (مــوذی) و حــەشــەره
دیســان لــوتیش بــه شکلێــکی جــوان
لــه نــاوەراســت ڕوو دروســت کــرد بۆمــان
(مشتمل) به سەر دوو کــون و یــەک بــەیــن
بــەو دوو کونانــه ئــەلێــن (مِنخَــرَین)
بـــه دەماغـــــەوه ڕەبـــــت دراوه
(حاســه)ی (شــامه)شــی تیــا دانــراوه
تــا بــاش بــزانین بــه (حاســه)ی (شــامه)
لــه بۆنــا خۆشــی و ناخۆشــی کامــه
پێیشی وەر ئەگــرین هــەوای ســاف و روون
بـــۆ (مدافعـــه)ی گـــەرمـــایی دەروون
لـــه کـــاتی خـــەو وەختـــی ئـــاوو نـــان
دەماغـــه کۆمـــەک بـــۆ هـــەناســـه دان
بوخـــاری کـــەللەت بـــۆ ڕائـــەکێشـــێ
تــا بــه هــۆی دەردۆ ســەرت نــەیــەشــێ
لــه لۆتــا نــەختێ مــوی تــەڕ دیــاره
بـــۆ گلدانـــەوەی تـــۆز و غوبـــاره

---

١ - حەشەره ، جانەوەر

ئـــەو پارچـــە گۆشـــتە کـــە لـــە دەم دایـــە
هێـــزی (ذائقـــە) و لـــەمســـیی تێـــدایە
ئالـــەتـــی زانـــین تـــامی تـــەعامـــە
کامیـــان بـــەلـــەزەت یـــا کـــام بـــێ تامـــە
چونکـــە قســـەی دڵ خـــەفـــی و نیهانـــە
تـــەرجمـــانی ئـــەو ســـەری زمانـــە
حەنجەرەش دارای نەوعـــێ شـــکڵ و رەنـــگ
بـــەعزێـــکی واســـع بـــەعـــزێ تـــری تـــەنـــگ
درێـــژ و کـــورت و پتـــەوو خـــەفیـــف
زبـــر و نـــەرم و ڕەق ئـــەســـتور و زەعیـــف
حیکمەتـــی فـــەرقـــی ئـــەم شـــکڵ و ڕەنگـــە
لـــە بـــۆ ناســـین و تـــەمیـــزی دەنگـــە
ئـــەمانـــە هـــەرچـــی کـــە نـــاو بـــراوە
لـــە ســـەد یـــەکێـــکی بـــەیـــان کـــراوە
ئـــەمـــە بـــێ ســـانیع بـــێ(مـــدبر)ێ
لـــەو ئـــاوە چلـــۆن وا دروســـت ئـــەکـــرێ
نینـــۆک کـــە ئـــەدنـــای هـــەمـــوو ئـــەعزایـــە
هـــەر کـــەس کـــە نـــەیـــبێ هیچـــی لـــێنایـــە
نـــە وردە هـــەرگیـــز هـــەڵ ئـــەگرێـــتەوە
نـــە گـــرێ گۆڵـــەی بـــۆ ئـــەکرێـــتەوە

سەر پەنجەی هەموو لە کارا ئەخورێ
بۆی ناخورێ ئەگەر جێیەکی بخورێ
جا هەرچی عاید بە مەعیدەیە
جەرگ ئەیکا بە خوێن لە پاش موددەیە
سپڵ و گورچیلە و زراو بە جارێ
خزمەتچی جەرگن هەر یەک بە کارێ
سپڵ ئەکێشێ بەشی سەودایی
زراو جەزب ئەکا قیسمی سەفرایی
نەوعی ئاویشی بە (کلیە) ئەدرێ
دوایی مەسانەش لەوی وەر ئەگرێ
بە قەزای حاجەت موحتاجی ئەکا
لە رێی خۆیەوە (اخراج)ی ئەکا
ئەم هەموو خەلق و رەبت ئەسبابە
سنعەتی دەستی (رب الأرباب)ە

❋❋❋

## نمونەیەکیتر (بیر لە ڕێی تەکامووڵەوە)

بێ تەماشاکە لە ڕەحمی خودا
ساوا کە وەختێ وا لە ڕەحەمدا
هەر وەها دێت و لە گەورە بونە
ڕەحەمیش تەنگ و تاریک و تونە
چۆن ئەو منداڵە هیدایەت ئەدا
کە حەولی دەرچون لەو جێگە بدا
سەر شۆڕ ئەکاتۆ وەک ئەهلی شعور
پاشی بە عەکسی پێشوی بەرەوژوور
ڕێی دەرچونی خۆی ئەدۆزێتەوە
ئەو جار لە دایکی جویێ ئەبێتەوە
جا چونکێ جیسمی لیق و زەعیفە
موحتاجی خۆراک نەرم و لەتیفە
لەم بەرەو بەری سینەی ئەو دایکە
بۆی هەڵواسیوە خوا دوو مەمکە
هەمیشە هەر دوو پڕ لە شیری ساف
لە بۆ ئەو تیفلە زیاتر لە (کَفاف)
بۆ ئەوە کەوا دەمی لێ گیرکا
بتوانێ بە مژ چاک جەلبی شیرکا
بە تیبقی دەمی دوو دانە گۆپکە
دایناوە هەر یەک لە سەر یەک مەمکە

هەر گۆپکەیەکیش چەند کونی تیایە
جێی پیاهاتنی شیری ساوایە
نە ئەوەندە واسیع شیری لێ بڕژێ
نە ئەونەش بچوک کە لە بۆی نەمژێ
سەیریکە چۆن خوا پێی ئەفامێنێ
کە مەمکە بگرێ و شیر بمژێنێ
تەنها هەر شیرە خواردنی منالْ
تا قوە ئەگرێ بە موددەی دوو سالْ
بەو بەینە هێزی لە بۆ خەلق ئەبێ
گۆشتی پتەوو ئێسکی ڕەق ئەبێ
ژیانی ئیتر بە شیر مەحالْە
موحتاجی خۆراک کولاو و کالْە
ئەوانیش موحتاج بە دان و خرێن
چونکە بێ جوین زەحمەتە بخورێن
بڕوانە کە چۆن خەلاقی عالەم
دان و خرێی ڕێک بۆ ڕوان لە دەم
وەختێ گەورە بوو لاناکاتەوە
لە مانە سەرێ بیر بداتەوە
بزانێ کە هۆی خەلقی خۆی چی یە
دێوانە ئاسا پێی مەتلەب نیە

## بیرێکی کورتی ئافاقی

دوا ئەوە ئینسان بیر لە نەفسی خۆی
تەواوکا ئینجا مومکین ئەبێ بۆی
بە تەرتیب بڕوا بۆ گەشتی ئافاق
تا(واصل)ئەبێ بە خودای(خلاّق)
پاش نەفسی زەوی ئینجا هەوایە
پاشتر ئەوانە کە لە جەودایە
دوای ئەوان ڕۆژ و ئەستێرە و هیلال
ئەفلاک و کورسی و عەرشی (ذوالجلال)
حەزرەتی عومەر فارۆقی ئەعزەم
دوا تەی کردنی ئەمانە سەرجەم
فەرمووی بە قەولی پڕ لە ئەدەبی
(قد رأى قلبي جناب ربي)
بۆیە بە ئەمری دەریا جاری‌یە[1]
بە گوێی قائدی دا (یا ساریە)
بەڵام لازمە لە بۆ ئەوانە
کە (صرف)ی فکر ئەکەن لەمانە
بە هەموو جوزئا وەک ئاوی جاری
بیا هەیئەتی کەشفی ئەفکاری

---

[1] - ئاماژەیە بۆ جاریی بوونی رودی نیل بە ئەمری حەزرەتی عومەر ڕەزای خوای لێ‌بێ

هیچ جوزئێ لەوا بەجێ نەهێڵێ
تا هێڵی عیبرەت لەوا نەکێڵێ
بەشەر لە ئەرزا کە یەک (خُطوە)یە
دارای ئەو هەموو جوزء و عوزوەیە
ئەم ئەرزە گەورە واسیعە ئەبێ
عوزوی چی‌بێت و ئەجزای چەندە بێ
بەرد هەر بە عەینی ئێسقانی ئەوە
شاخ و کێو ڕەگی ئەرکانی ئەوە
(نهر) و (شط) هەر وەک خوێنی بەدەنی
ئەجزای لە ئەنواع چشتی مەعدینی
سەوزی و نەباتات توک و مویەتی
خاکیش بە چەشنی پێستی ڕویەتی
سک پڕی زەوی بەو گشت مەوادده
لە (مَعادِن)ی زۆر بە (اِفادە)
ئەجزای تا بڵێی خاریج لە حەسرە
هەموو پڕ نەفع و فائیدە و بەهرە
گەرچی لە ناسین غاڵبیان بیکرن
ئێشتا محەلی حیددەتی فیکرن
بڕوانە زەریف کە چەند ئەم ئەرزە
دوورە بەینی لەو ئاسمانە بەرزە

لــە ئــەترافــەوە وەک بــەرزی و نــەوی
لـــە یـــەکتـــر دوورن ئاســـمان و زەوی
ئــەرز ئــەبــێ لــەســەر چــی دانــرابێ
یــا ئــەبــێ بــەچــی ڕاگیــر کــرابێ
مــەســەلا بڵێــین ئــەرز لــەســەر ئــاوە
ئــەی ئــاو خــۆی لــەســەر چــی دانــراوە؟
گەر ئەوییش لـە سـەر هـەرچـی وەستابێ
بنکـی هـەمـووی هـەر ئـەبـێ فـەزا بـێ
ئــەرز لــە ســەر فــەزا بــەم گرانیــە
ئــاخۆ ســەبــەبــی وەســتانی چیــە؟
وەک لـــە خـــوارەوە عـــەمـــودی نیـــە
عــەلاقــەی ســەریــش وجــودی نیــە
گــەر ئــەڵێــی لــە بــۆ ئیمســاکی زەوی
لــە (اجرامــا)یــە جازیبــەی قــەوی
نایــەڵــێ لادەن قــەت لــە مــەرکــەزا
ئــەوهێــزە لــە بــەیــن ئــەوان و ئــەرزا
کــێ بــوو عیلمــی بــوو ئــەبــێ جــازبێ
بــۆ ڕاگرتنــی ئــەمانــە بــبێ
لــەگــەل ئــەوانــا ئــەمــیش دروســتکا
کــە بــەلای ڕۆچــوون بــە هیچیــان نــەگــا

مەعنای جازیبەیش بێگومان وایە
وەستانی ئەجرام قودرەتی خوایە
چۆن یا ئەم کەونە فەوری دروست بوو
وەیا بەرودوا بەینێکی پێچوو
گەر ئەڵێی فەورەن ئیتر چیت ئەوێ
ئەمە بێ قودرەت چۆن دەست ئەکەوێ
یا هەندێ لە پێش هەندێ لە دواوە
بە تەدریج بەین بەین دروست کراوە
بەر لەوەی ئەویان دروست نەکراوە
بە کام جازیبە ئەمیان وەستاوە؟
کەوابوو ئیتر هەر تەوانایە
کە ڕاگرتنی لە تەوانایە
تەبیعەت ئەگەر بێ عیلم و دەرکە
بەشی لە مەیل و حەیاتا تەرکە
شک نیە ئەوە ئیتر جەمادە
(مصدر) نیە بۆ فیعل و ئیرادە
گەر ئەڵێی زیندو و باتەوانایە
ئیرادەی هەیە و بە شت دانایە
مەڵێ تەبیعەت؛ ئەوە خودایە
پەروەردگاری گشت ماسیوایە

تەبیعەت چوارە ئەبێ جەمیعی
بۆ پێک هاتنی جیسمێ تەبیعی
چار نیە ئەبێ یەک بگرن هەموو
لە فاعیلین و مەفعولین هەر دوو
کە ناویان ئەبرێ بە زوبان کوردی
بە تەڕی و وشکی و بە گەرمی و سەردی
قەت وجودیشیان نابێ بەبێ شک
غەیری لە گەرم و سارد و تەڕ و وشک
بەبێ جامیعێ کۆبونەوەیان
مەحالە ئیتر ڕێک کەوێ بۆیان
نیسبەتی ئیجاد لە تەبیعەت دان
تەنها هەر نیسبەت ئەدرێ لە نادان
حەتا خاریجیش ئەهلی سەقافە
زانای ریازی و فەننی فەلسەفە
جولوجیون و عولەمای فەلەک
لە تەبیعەتدا(أخصاء) یەک یەک
ئەڵێن ئەو عیلمە کەوا هەمانە
لەسەر وجودی خودا بۆڕهانە
(باستورکێت) ئەڵێ من بڕوام وایە
ئەگەر لەم عیلمەم زیاتر ببوایە

لــە ئێستەم زیــاتر ئــەبــوو بــێ گومــان
ئیمــان بــە خــودای ئــەرز و ئاســمان
(وەتــز) کــە عــوزوی ئــاکادیمیــە
زانــای زانســتی کیمیائیــە
لــە کولییــەی (طبیّە)ش ئــەوە عــەمیدە
ئــەڵێ لــە باســی بــڕوا و عــەقیدە
ئــەگــەر لــە خۆمــا ببیــنم وەخــتێ
سســتی ئیمــانم بــە خــودا نــەختێ
لــە بــۆ تــەسبیتی زۆر بــە ئــەهمیە
رووی دڵ ئــەکــەمــە ئــەکادیمیــە
(ادمنــد هربرتــی) جیلــوجی مــەعرووف
لــە جامیعــەی(ســۆڕبونا) فیلــەسوف
دەڵــێ مــەحاڵــە (مــۆدی)بــێ قــەت
عــیلم بــۆ کــوفر وەیــا مــادیــەت
(کوشــی ریاضــی)ئــەڵــێ مــن بــڕوام
تــەواو ســابیتە و مــەحکــەمــە بــە خــوام
ئــەم عــەقیدەشمە نــەتیجــەی ئــەوهام
وڕاســی نیــە بــەڵــکوو مــن بــڕوام
لــە جــدیاتی ســەلیقــەی خۆمــە
بــە هــۆی تــەحقیقــات عــەمیقــەی خۆمــە

زانـــای زانســـتی تـــەبیعـــە(فـــابر)
لـە خوسـوس بـڕوای بـە خـودای قـادر
ئـەڵـێ زەمانـە گشـت هـەوای شێـتی
تێـــدایە و ئێســـتە زیـــاتر تیایـــەتـــی
شێـــتی تـــەواو ئالـــەم زەمانـــە
بـــاوەڕ نـــەبـــویی گـــەلـــێ نـــەزانـــە
پێـم خۆشـە پێسـتم دابـڕنن لـەبـەر
نـەک بـڕوام بـە خـودا لـە دڵ بێـتە دەر
فیلـــەســـوف (سبنســـر)ی ئینگلیســـی
کـە لـە تـەبیعـەت گـەیـوە بـە بـەرزی
لـــە تـــەربیـــەدا وتوویـــە هـــەرکـــەس
عیلمـــی تـــەبیعـــەت بخوێـــنێ بـــە دەرس
ئـەگـەر ئـەو عیلمـە بـە سـەتحـی گـەری
لـــەگـــەڵ ئیســـتیعجال بکاتـــە بـــەری
وورد وورد ئەیکێشێ بێ شـوبهە و گوومـان
تـا لـە پڕ وەسڵـی ئـەکـا بـە شـەیتـان
ئەمـا گـەر لـە گـەل ڕەویـە و تـەحقیـق
بـــە(تعمُّـــق)ی بـــەلیـــغ و تـــەدقیـــق
بیخوێـــنێ نومـــای فیکـــری پـــێ ئـــەکـــا
تـــا بـــە خـــالیقی تـــەوانـــا ئـــەگـــا

بەرزتری زانای فەلەکی دوکتەر
(هرشیل) لە باسی عەقیدەو باوەڕ
وتویە بێ شک تا لە ئافاقا
توسع بکا عیلم لە نیتاقا
بورهانی تەواو دامغ بە عەدەد
زیاد ئەکات لەسەر وجودی ئیزەد
کە خالیقێکی وایە قودرەتی
نە حەددی هەیە نە نیهایەتی
دوکتور(دینریتی)ئەڵمانی مەشهوور
لە غەربا نەبوو لە خۆی بەرەو ژوور
لە خسوس بڕوا و عەقیدە بەحسێ
دێنێتە ئارا لەگەل چەند کەسێ
لە مەشهورترین زانایان بەعزێک
جامیع و بەعزێ (مختص) بە عیلمێک
پاش مزاکرە و بەیانی بورهان
لەسەر وجودی خودای لامکان
هەموو دووسەد و نەوەد نەفەر بوون
بیست و هەشت لەوان ژیرە و زەبەر بوون
بیست کەسی تریش ماوە لەو بەینە
مەتڵەبیان نەبوو بەدین بن یا نە

دووسەد و چل و دوو کەس بە یەکجار
ئیمانی هێنا بە پەروەردگار
کافی‌یە هێندە وەرنە ئەجنەبی
زانایان هەموو شەرقی چ غەربی
هەر عیلمی خۆیان ئەکەن بە دەلیل
لە بۆ ئیسباتی خالیقی جەلیل
لە یەک کرتنی حمق و جەهالەت
تەوەلود ئەکا غولی (ضلالة)
مەعلومە عیلم و عەقڵ دوو چاون
بۆیە بە بەشەر هەر دوو دراون
کە ڕێی سەعادەت بۆ دین و دنیا
ببینێتەوە و لێیان لانەدا
جا هەرکەس عەقڵی هەیە و دانایە
ئەوە سەر بەرزی هەر دوو دنیایە
ئەوەش لە عیلم و عەقڵا مەحرومە
بێ‌گوومان ڕێگەی ڕاستی لێ‌گوومە
بەڵام هەر وەک چاو بۆ هەموو کەس دەس
نادا لەویشا کوێرە گەلێ کەس
دەرەک پاییں‌تر لە ئەو(ضلالا)
بێ ئیمانیە بە خوای تەعالا

دووره لـه گومـڕا ڕێـی بـڕوا بـه خـوا
پێـی شـەلـە هـەتـا تـەبێـعەت ئـەڕوا
ئـەو كـەسـە كـە تـۆی دروسـت كـردووه
ئـەزەل پـەی بـە هـۆی ژینـت بـردوه
ئـەرز لـە بـەرد و خـاک بـۆ بینـای ماڵـت
دیسان دەسـت بـدات بـۆ كشـت و كاڵـت
عـەلاقـەیـەكـی جازیبـە لـە بـۆی
دروسـتكاو بیگـرێ بـە قـودرەتـی خـۆی
(تجـاذب) یـا خـۆ هـەر خـۆی قـودرەتـە
وەیـا جیـاوازه و بـە هـۆی قـودرەتـە
كـەون ئـەگـەر لـە پـڕ خولقـا بـەجێـیە
وەرنـە جازیبـەی عامـە لـەكوێـیە
ئاوێـكی نـەرمـی ساردی سـاف و پـاک
بـۆت بخاتـە دەر لـە ناوسـكی خـاک
بـۆ جـل شـۆرین و نـان و نۆشـینت
حـەیـوان بـۆ بـەرگ و داشـت و دۆشـینت
هـەر دەنكـە دەغڵـێ سـەد دانـەوێڵـە
ئـەگرێـت و فكـرت لـەم فـەزڵـە وێڵـە
چونكە ئەر لـە دەنكـێ هـەر دەنكـێ بێنـێ
بـەشـەر چـی بخـوا و چـی لـێ بچێنـێ

خـۆر بـۆ تـەنـویری قـەسـری ئافاقـت
نـەسـیمی هـەوا بـۆ استنشـاقت
رۆژ بۆ سەنعـەت و کـەسـب و فـەلاحـەت
شـەو بـۆ ڕاکشـان بـە ئیسـتیراحەت
شەو ئەر نەبوایـە زۆر کـەس نـەئـەخـەوت
لەبەر تەماعی خـۆی نـەخـۆش ئـەکـەوت
سـەوزی حـەیوانـات لـە حـەرارەتـا
بـێ نـەشـئەو نمـا هـەمـوو ئـەفـەوتـا
دووبـارە ئـەگـەر هـیلاڵ نـەبوایـە
بـەشـەر بـێحیسـاب ئـەبـوا بمایـە
زەویـش نـەی ئـەدی کـە تێـدا بـژی
رۆحلـەبـەر وەیـا بـڕوێ و گیـا بـڕوی
گـەر شـەویـش تـولی ببوایـە دیسـان
موشـکیل بـوو ژینـی حـەیـوان و ئینسـان
کـەسـیش بـۆ هـیچلا ڕێـگەی نـەئـەبـرد
بە (ضـغط)ی سەرما حەیوان گشت ئـەمـرد
بـەبـێ گـەرمـی رۆژ زەحمـەت بـوو بـاران
برژێـتـە خـوارۆ بـۆ دێـمەکـاران
موختـەسـەر زۆرتـر عولـەمـای فـەلـەک
ئالـەمـا ڕەئیـی گشـتیان بـوون بـە یـەک

ئـەڵێـن ئـەو هـەمـوو ئـەستێـرە زۆرە
کـە ڕۆژ شـاراوەی ژێـر پـەردەی خـۆرە
تـەنها یـەکێـکیان ئـەگـەر تیا بچێ
نیزامـی وەزعـی کـەون تێـک ئـەچێ
چۆن لـە خـۆوەبـوون بـێزیـاد و بـێکـەم
بۆڕێـک کـەوتنـی نیزامـی عالـەم
وە یـا لـە خۆتـا ئـەم گشـت قوایـە
کـە هـەریـەک نـەفعـی خـۆی لـە ڕوایـە
کـەسێ ئـەمانـە ئـەبـێ دروسـت کـا
عیلمـی پێـی بـبێ و دەسـتی پـێبگـا
ئـەوکـەسـەش تـەنها خـوای تـەعالایـە
زاتێـکە لـەتیـف لـەبینـین نایـە
بـەچـاو ڕوئیـەتـی خـالیقی ئـەقـدەس
لە دنیـا هـەرگیـز دەسـت نـادا بـۆ کـەس
بەڵکوو بـێ گوومـان تـۆ بـە چـاوی خـۆت
حسسی نەفسی خۆن مـومکین نـابێ بـۆت
ئـەم عـیلم و عیشـق و حـوزن و نیشـاتە
ئـەم(قبضـيّة) و ئـەم(انبسـاط)ە
ئەم فـەهـم و عـەقـڵ و نوتـق و حـەیاتـە
ئـەم عـەزم و هـۆش و حـیلم و حـەیاتـە

هــەمــوو بــە ڕۆحــی تــۆوە مــەربوتــە
جــەســەد بــەرگێــکە لــەمانــە ڕووتــە
چاوت هـەر دەرکـی ئـەو بـەرگـە ئـەکـات
دەستی بە روئیەت نـەفسـی خـۆی ناگـات
وەخــــتێ کـــە (قـــابض)رۆح دەردەهێـــنێ
جســـد چـــۆن بـــوە هـــەر وە ئـــەمێـــنێ
ئەی کوا حـەیـات و عیشـق و عیلمـەکـەی
کوا عەقڵ و هۆش و نوتـق و فـەهمـەکـەی
مەعلووم بوو هەموو ئـەوسـافی ڕۆح بـوون
پێـکەوە هـەمـوو لـەگـەل ئـەو دەرچـوون
کە تـۆ نـەفسـی خـۆت بـە چـاو نـەبینـی
لـــە نـــەبینینـــی ژوورتـــر ئـــەمینـــی
چاو وەکـوو وتمـان بـەو گشـت عـەیبـەوە
کـەی دەرکـی ئـەچـێ بـەلای غـەیبـەوە
بـە تـەسـدیقی رۆح بـێدەنـگ بسـازە
هێــــنایەڕوو بــــۆت عولــــومی تــــازە
ساڵــی هــەزار و هــەشتســەد و حــەفتـا
دوکتــور (مســمر)ی ئــەڵــمانی هــەســتا

بۆ تـەحقیقـی ڕۆح گـەلێ خـەریـک بـوو
نەتیجـەی سـەعیـی بـەخـەسار نـەچـوو
ڕێـی بـە (تنـویم)ی موغناتیسـی[١] بـرد
ئەنجـا بـە عـەمـەل بـاش ئیسـباتی کـرد
کە ئینسـان تـەنها هـەر جیسـمی عـادی
نیـە یـا خـۆ ڕووت ئـەداتێ مـادی
(مسـتودع)ە بـۆ ڕۆحێـکی وەهـا
زیـدی مـادی‌یـە لـە گشـت وجوهـا
(مادیون) لـەمـە هـەمـوو سـەرسام مـان
چاریـان هـیچ نـەمـا بـەغـەیری ئیمـان

## سەرنجێکی تازە لە بونەوەر

ئێـمە کـە ئـەعـزای خۆمـان نـەزانـین
چ فکـرێ بکـەیـن لـە ئـەجـزای زەمـین
یـا لـە خـەلقـی ئـەو حـەوت ئاسـمانە
کـە دوور لـە دەرکـی حـەواسـمانە
بـەغـەیری شـینی و گـەشـی ئـەستێـرە
چـاو لـە بینینـی بـاقی‌تـر کوێـرە

---

[١] - خەوی هیپنوتیزمی

«نُـــرِی إِبْـــرَاهِیم» هــــەتــــا «مُـــوقِنِین»[1]
گـــەر بخوێــنینۆ بـــاش حاڵـــی ئـــەبـــین
کـــە مـــەلـــەکـــوتی ئـــەرز و ئاســـمان
غـــەیـــری ئـــەوەیـــە دیویـــە حـــەواســـمان
هـــەرچـــی کـــە دەرکـــی ئێـــمەی پـــێ‌بگـــات
حەیوانیش بێ‌شـــک ئـــەوە حـــیس ئـــەکـــات
وائێمەیش لەگەڵ حەیوان شەریـــک بـــووین
لە ڕوتبەی عیرفان تەرد و تـــەریـــک بـــووین
حیکمـــەت لـــە خـــەلقـــی نـــەوعـــی ئینســـانی
ئـــەوەبـــوو ئێـــمەیـــش وا نـــەمـــانزانی
بـــەڵام مـــەجمـــوعی ئـــەوزاعـــی یـــەکســـەر
وازیحـــەو عـــەیـــان بـــۆ ئـــەهلـــی نـــەزەر
یـــانی ئـــەوانـــەی مـــەعریفـــەت دارن
(خـــەواصـــی غـــەواص) بـــەحـــری ئـــەسرارن
هەموو ئەفەرمـــوون ئـــەو گشـــت ئـــەستێـــرە
کـــــەوا نایـــــەنـــــە ریـــــزی ژمێـــــرە
کامیـــان زۆر بچـــووک لـــەگشـــت کـــەمتـــرە
هـــەشـــت کـــەڕەت لـــە ئـــەرز مُعظَّمتـــرە

[1] – ئاماژەیە بە ئایەتی٧٥ی سورەی الانعام.

زەوی لە چاو ئەو رۆژە بوڵەندە
کەمترە سەد و شەست و ئەوەندە[1]
ڕەنگ و سورەتیان لە یەکتر جیایە
لە هەموو شکڵ و ڕەنگێکی تیایە
خۆلاسە ڕەنگ و شکڵێ کە لێرە
هەیە مەوجودە لە ناو ئەستێرە
هەندێکی وەک گوڵ هەندێ وەک میزان
هەندێکی وەک شێر هەندێ وەک ئینسان
ڕەنگیش وەک سوری سپی و رۆنیاسی[2]
شینی و پەمەیی ڕەشی و (رصاص)ی
شکڵێ کە لەگەل شکڵێ نزیکە
لە یەکێ تریان دوور و تەریکە
یاشینی مەسەلا نزیک بە سوورە
لەگەل ڕەنگی تر مەسافەی دوورە
حیکمەتی ئابەم وەزع و وەزعانە
مەعلومی نەزەر ئەهلی عیرفانە
وەسفی عیرفانیش بۆ کەسێ نابێ
کە هەر لە حاڵی حەیوانیابێ

---

[1] – ئەستێرە ناسەکان دەڵێن رۆژ ١٣١٠٠٠٠بەرابەر زەویە.

[2] – رەنگی پەمەیی تۆخ.

ئـەبێ ویسـعەتـی فـەلـەک کامـەبێ
کە مـەرکـەزی گشـت ئـەم ئـەجرامـەبێ
سەیـری ئـەم ڕۆژە چـەنـد سـەریـع ڕەوە
مـەسـافەی دەورەی یـەک رۆژ و شـەوە
بۆ چـۆڵ بـوونی جێـی بـە یـەک حـەرەکـە
سەد و شەسـت ئـەونـەی رۆژی گـەرەکـە
بۆیـە حـەزرەتـی ڕەسـولی جـەلیـل
کـە لـەبـۆ زەوال پرسـی لـە جیبریـل
(هل زالت الشمس) فـەرمـووی (لا . نعم)
فەرمووی ئـەوە چـۆن وتـی عـەرزت کـەم
لـە (لا)وە هـەتـا ئـەوەڵـی(نعـم)
پێنسەد سـاڵ رۆیـی رۆژ بـێ زیـاد و کـەم
مـەعلوومـە چونکـە هـەر لـەحـزە ئـەبێ
بـڕوا بـە مـاوەی پـانی کـەوکـەبێ
چوون زەمان تلـووع ئـەووەڵ جـوزئی کـەو
کـە بـە هـەتـادێ ئـاخر جـوزئی ئـەو
بـە وردی هـەرگیـز نایـەتـە بـەیـان
بـۆ کـەس چۆنیـەتـی وەزعـی ئاسـمان
کـەوابـوو لـەولا سـەرفـی نـەزەر کـە
تەماشای ئەدنای گشـت گیـان لـەبـەر کـە

کـــەمتـــری هـــەمـــوو کـــە مێشـــولەیـــە
کـــەم جـــورم و جوســـە و زۆر بچکۆلـــەیـــە
هـــەر وەک بـــێ حـــەجـــم و خـــوار و زەلیلـــە
لـــەســـەر هـــەیئـــەت و قیافـــەی فیلـــە
بـــە خرتـــومێ تیـــژ باریـــک و کلـــۆر
خوێن لـــە گامێـــش و گـــا ئـــەمـــژێ بـــە زۆر
بـــەو نـــەختـــە حـــەجمـــۆ کـــە پێـــی‌دراوە
مـــەعیـــدەی لـــە بـــۆ دروســـت کـــراوە
دارای ماســـــکە و جازیبـــــە و دڵـــــە
پـــەلـــی بـــێ ئـــەژنـــۆیش لـــەوا حاسڵـــە
لـــــە دەرونیایـــــە هێـــــزی مانیعـــــە
قـــــووەی غازیـــــە و هـــــەزم و دافیعـــــە
پێڵـــوو کـــە دایـــم چـــاو ســـەیقـــەل دەرە
چـــاوی بـــێ پێڵـــوو جێـــگەی خـــەتـــەرە
چـــوون چـــاوی وردە مێـــش بـــێ پێڵـــوە
خـــوا بـــە جۆرێـــتر چـــاری فـــەرمـــووە
تـــەماشـــاکە چـــۆن بـــە هـــەمـــوو حاڵـــێ
بـــە هـــەر دوو دەســـتی چـــاوی ئـــەماڵـــێ
هـــەرچـــەنـــد وەکـــوو فیـــل دروســـت کـــراوە
بـــــەڵام دوو باڵـــــی زیـــــاد پـــــێ‌دراوە

تـــێبفکـــره لـــەم دەعبـــا بچوکـــە
لـــەگـــەل ئـــەوەشـــا بـــێوەزن و ســـوکە
ئـــەزانـــێ بـــەهـــۆی مـــەزەرەتـــی خـــۆی
نـــاوەســـتی ئـــەگـــەر دەســـتت بیـــەی بـــۆی

## نمونەیەکیتر لە یەکیەکی چشت

هـــەرچـــی لـــە کـــەونـــا فکـــری لـــێ بکـــەی
ڕێ بـــۆ ناســـینی ســـانیعی ئـــەبـــەی
مـــەســـەلا بلێـــین ئـــاو خـــاوەن ســـیقلە
خـــۆی بـــە تـــەبیـــعەت مایـــل بـــە ســـوفلە
سەرەوژوور هـــەرگیـــز خـــۆی ســـەرناکـــەوێ
مـــەگـــەر قـــوەیـــە قـــەوی لێـــینـــەوێ
ئـــەی بـــۆ ئـــەبینـــی ئـــەوەنـــدەی نـــەختێ
ئـــەگاتـــە پۆپـــەی هـــەمـــوو درەخـــتێ
گـــەر ئـــەڵێـــی پۆپـــەی ئـــەو دارە ئـــەشـــێ
جازیبـــەی تێـــدا بـــبێ ڕایکێشـــێ
کـــێ ئـــەو جازیبـــەی لـــەوێ دانـــاوە
بـــۆ ڕاکێشـــانی ئـــەو نـــەرە ئـــاوە
مـــەعلـــووم کـــە ئیشـــی کـــەشێـــکی وایـــە
بـــەهـــەرچـــی مـــەیلـــی بـــوو تـــەوانایـــە

## نمونەی تریش

ئـەم کـەونـە عیلمـە و (تفکـر) دەرسـە
مـەوزوعـیش ناسـین خـوای (اقـدس)ە
لـە هـەمـوو دەرسـا میسـالێ وەهـای
هێـناوە بـەوە رێ بـەریـن بـۆلای
هـەیـە مـەعـدومێ مـەوجـود نومایـە
بـەعزێـکیش مـەوجـوود نـابوود نومایـە
ئـەو گێـژەڵـووکە کـە دێـت و ئـەڕوا
ئـەبینـی خاشـاک بۆخـۆی خـوول ئـەخـوا
ئـەم تـۆز و خۆڵـە کـەوا دیـارە
لـە خولـدانی خـۆی بـێ ئیختیـارە
(مُحـرّک) لـەوا حـەقیقـەت بایـە
ئـەویـش لـەتیفـە و لـەبینـین نایـە
وابـا مـەوجـودی نـابوود نومـا بـوو
خۆڵیش مەعـدوومی مـەوجـوود نومـا بـوو
کـەونـیش هـەر وەکـو ئـەو خۆڵـە وایـە
(مُحـرّک) مـەخفـی مـەعلـووم خوایـە
جـەولـەی (تفکـر)بـەم مـەیدانانـە
لـە وسـائیلی قـوەی ئیمانـە
عـاقڵ گـەر بێـتو بـە وردی نـەزەر
لـەم کـەونـە بـەرزا بکـا سـەراسـەر

لێـی مـەعلـوم ئـەبـێ ئـەمـە بـێ گومـان
قـەسرێـکە خـاریج لـە هـەمـوو نوقسـان
ڕێـکخراوە پوخـت لـە هـەمـوو ئـەنـدامی
خاڵـــی لـــە حیکمـــەت نیـــە هیچکـــامی
بـــەڵـــکوو زەڕاتـــی هـــەمـــوو ناتیقـــە
کـــە (صُـدق) نیـــە خـــاوەن خالیقـــە
ئـەی نیهـان بـە زات بـەبـەخشـین دیـار
تـــۆ وەکـــوو ئـــاوی ئێـــمە ئاشـــی کـــار
تـۆ بـە چـەشـنی بـای ئێـمە وەک غوبـار
بـــا نیهانیـــــە و تـــــۆزی ئاشـــکار
ڕووی شـــوعلەی ڕۆژی کـــەماڵـــی ئیمـــان
بـــەدائـــیم بخـــەســـەر زەوی دڵـــمان
هەر دڵـێ کـە ڕووی کـەچ بـێ لـەو خـۆرە
تاریکـــــە دایـــــیم ئافـــــاتی زۆرە
بیهێـــنە دەســـمان کردنـــی هـــەرچـــی
خێـرە و مـەحفوزمـان بکـە لـە کـەچـی
دیلـــی دەلیلمـــان مـــەکـــە دەخیلـــە
بـــێ نـــووری میهـــرت دەلیـــل زەلیلـــە

## نیشان لە سەر پێویستی پێغەمبەران

دوا ئـەمـە زانیـت کـە ئـەم تـەرتیبـە
ئـەم ئینتزامـە جوانـە عـەجیبـە
دارای سـانعی ساحێـب قـودرەتـە
کـردەوەی هـەمـوو پـڕ لـە حیکمـەتـە
ئـەمجـارە هـەڵسـە بچـۆ بـۆ دێـیـە
بپرسـە ئاغـای ئـەم دێـیە کـێـیـە
بـاش تماشـاکە لـە ئومـوراتی
لـە ئـەمـروو نـەهـی و لـە دەسـتوراتی
خـۆی قانونێـکی لـە بـۆ دانـاون
بـە لوتـف و تـەهدیـد وەعـدە دراون
هـەرکـەسێ بـەشـی کـەسێ داگیرکـا
ئـەبـێ چـەنـد ڕۆژێ پـێ لـە زنجیرکـا
ئـەوەی لـە ئـەمـرم بکـا سـەرکـەشـی
نـەتیجـە بـەشـی ئـەوە بـێ بـەشـی
شـەخسێ کـردەوەی پیس و خـراپ بـێ
ئـەبـێ ڕەزیلـی قـەمچـی عـەزاب بـێ
وەیا هـەرکـەسێ شـیرین ئـەخـلاق بـێ
بـە ئومـووراتی چاکـە موشـتاق بـێ
موتیـع بـێ لـە بـۆ ئـەمـروو فـەرمـانم
خۆشـەویسـترە لا مـن لـە گیـانم

بــه قــەدره لــه لام هــەرچێــکی ئــەوێ
مــادام مــومکین بــێ پــەکــی ناکــەوێ
بــەڵام بــۆ تــەبلیــغ ئــەم دەســتوراته
موبــەلليغــی چــاک لــه زەروراتــه
ئــەبــێ بگــەڕێ بــۆ شــەخســی شــەریـف
عــاقڵ و لایــق ئــەمــین و عــەفیـف
بــه ڕشــد و هونــەر تینــەتــی پــاک بــێ
نیەتی لـەگـەڵ هـەمـوو کـەس چـاک بـێ
ئومــووراتی خــۆی پــێ موحــەوەل کــا
وەفقــی ئــارەزوی ئاغــا عــەمــەڵ کــا
ئــەی ئــەم زەمینــه و ئــەم ئاســمانه
ئــەم مانــگ و ڕۆژ و ئــەستێــره جوانــه
ئــەم هــەواو هــەور و بــەفــر و بارانــه
ئــەم مــەعــادین و بــەرد و دارانــه
ئەم گەرمی و ساردی و وشکی و تـەڕیـیـه
ئــەم جــوانی و جــەوو بــەحــرو بــەڕڕیـیـه
ئــەم کــانی و ئــاوه ئــەم شــەت و نــەهــره
ئــەم ســودی دەریــا لــەو مــەدد و جــەزره
ئــەم جــوره دەوره لــەو ســەیاراتــه
تــەولیــدی فســول لــەو حــەرەکاتــه

ئـەو تـەرزە گـەڕان بـۆ زەبتـی ئـەوقـات
بـەمانـگ و بـە ڕۆژ بـە سـاڵ و سـەعـات
ئـەم بـێنـەوایـی و دەرد و میحنـەتـە
ئەم دەوڵەمـەنـدی و خۆشـی و سیحەتـە
یائـەم حـەیـوان و جـن و ئینسـانە
ئـەم بـەرزی و نزمـی و زیـادی و نوقسـانە
ئـەم هـەمـوو شـارەی پـڕ لـە ئـەجناسـە
ئـەم گشـت عالـەمـەی عـالی ئـەساسـە
ئەم فەهـم و نوتـق و عـەقـڵ و حـەواسـە
ئـەم زوڵـم و عـەدڵ و ئـەم درۆ و ڕاسـە
سـاحبی هـەروا حـەواڵـەی دەسـتی
دنیـای کـردون بـێ سـەرپـەرستی؟
نـازانم تـۆ چـۆن دڵـت ناترسـێ
بڵێـی پـاش خـەڵـقی لـێیـان ناپرسـێ
زەحمـەتـە ئـەوەنـد هـەمـوو بیـرت بـێ
دەسـتی بـێفکریـت لـە خـۆت بـەردابـێ
بڵێـی خـالقێ وا تـەوانـا بـێ
ئـەساسێـکی وا جـوانی دانـابێ
لـە نـاو ئـەم هـەمـوو عالـەمـا بـەشـەر
بڕازێنێـتۆ بـە عـیلم و هونـەر

لە دڵا چرای عەقڵی بۆ هەڵکا
تا فەرقی بەینی پاک و چەپەڵ کا
بە گوێرەی قووەی ئیدراک و نەزەر
بناسێ ئومور لە نەفع و زەرەر
چۆن ڕووی خەتابێ ئەبێ تێ نەکرێ
باری ئەمانەت سەرشانی نەخرێ
بە موبەللیغا یانێ پێغەمبەر
قانوونی خوایان چۆن نایەتەسەر
بیانترسێنی ئەگەر سەرکەش بن
لە سەعادەتی سبەی بێ بەش بن
مەهتووک و ڕسوای ڕۆژی حساب بن
هەمیشە خواری حەبسی عەزاب بن
یا بەو کەسانە ساحێب ئیمانن
موتیعی ئەمرو و نەهی قورئانن
موژدەی بەهەشتیان بە مەحزی رەحمەت
ئەداتێ دائیم بێ دەرد و زەحمەت
برا بزانە خاڵی لە گومان
نابێ تەکلیفی لێ نەکرێ ئینسان
مادام عاقڵین جێگەی تەکلیفین
دارای موجیبی موژدە و تەخویفین

چـــاک و بـــەد بـــەیـــان کـــراوە بۆمـــان
موبـــەللیـــغ ڕەســـول قـــانوونیش قورئـــان

## سروشتی ڕەوشتی پێغەمبەران
## علی نبینا و علیهم السلام

پێـــغەمبـــەر زاتـــی بـــە ئیقتیـــدارە
ڕازاوەی وەســـفی حـــەیـــا و ویقـــارە
هـــەر ڕاســـتی مـــەحـــزە قســـە و گفتـــاری
شـــیرینە هـــەمـــوو ڕەویـــە و ڕەفتـــاری
بەڕەحمە و ســـەخـــی شـــەجیعـــە و حـــەلـــیم
ئـــەمینـــە و ڕەشـــید تـــەبێـــعەت ســـەلـــیم
وێـــنەیـــان نیـــە لـــە کـــەمالاتـــا
میـــزاج دروســـتن لـــە گشـــت حالاتـــا
خوسوســـەن نـــووری چـــاوی کائینـــات
هـــۆی دروســـت بـــوونی زەوی و ســـەمـــاوات
ئەشـــرەفـــی هـــەمـــوو عـــەرەب و عـــەجـــەم
پێشـــەوای زومـــرەی ئـــەنبیـــا ســـەرجـــەم
بـــەدری بروجـــی حوســـنی خیسالـــە
نـــەیـــری ئـــەوجـــی فـــەزڵ و کـــەمالـــە
زاهیـــرەن بـــەشـــەر حـــەقیقـــەت نـــوورە
داوێـــنی لـــە گـــەرد ڕەزاییـــل دوورە

ئــەعــلا دەرەجــەی چـــی فـــەزائیلـــە
لـــەو ســــەروەرەدا هـــەمـــوو حاســـیلە

## ڕەزیلە و فەزیلە کامانەن

گـــەر ڕەزائیلـــت لـــێ مـــەعلـــووم نیـــە
یـــاخود نـــازانی فـــەزائیـــل چیـــە
ڕەزیلـــە خـــولقی قـــەبـــیح و پیســـە
لـە هـەر کـەسا بـێ دەنـی و خـەسیسـە
وەک کبـــر و غـــورور یـــا حیلـــە بـــازی
وەک ئـەمـە ئینسـان لـە خـۆی بـێ ڕازی
بـــێ وەفائیـــە و غـــەدداری و چـــروک
بـێ ئـەدەبیـە و تـەبێـعەتـی سـووک
وەک هـــەرزە خـــویی وەک فیتنـــە بـــازی
غـــەش و ڕوو گـــرژی یـــا قوماربـــازی
زوبـــان درێـــژی و جوێـــن و شـــەرارەت
یـا وورد بوونـەوەی خـەلـق بـە حقـارەت
درۆ و خیانـــەت توونـــدی و کـــەللەشـــەق
تانـە و موزیـڕی و ئیسـتیهزا بـە خـەلـق
حیـرس و تـەمـاع و نـەوسـنی بێحـەد
نـەزەر لـە غـەیرەمـەحرەم لـە ئـەمرەد

ئـــارەزووی زینـــا و خـــواردنی حـــەرام
سواڵـــکەر دەرکـــردن بـــە قســـەی بێـــتام
وەک تـــرس و حـــەســـەد یـــا بـــوغز و کینـــە
یـــا لـــە حـــوببی خـــوا خاڵـــی بـــێ ســـینە
هـــەر ئـــەوەنـــدە نـــین زۆرن ڕەزائیـــل
ئینجـــا بێـــینە ســـەر باســـی فـــەزائیـــل
هەر چەن کـــە عـــەکسی ئـــەمانـــەن بـــەڵام
دووینـــێ لـــەویـــش ســـەڵاحـــە لـــەلام
ئـــەدەبـــە و تـــەمکـــین ویقـــارە و حـــەیـــا
بـــێموبـــالاتی لـــەگـــەل ئـــەم دنیـــا
وەرع و تـــەوەککـــول زوهـــد و تـــەقوایـــە
مـــەحـــەببـــەتـــی زۆر لـــە گـــەل خودایـــە
ویســـعەتـــی ســـەخـــا و حـــیلم و قـــەناعـــەت
سەبـــر و ســـوبات و مـــەجـــد و شـــەجاعـــەت
ڕووخۆشـــی و بـــەشـــوش شـــیرین زوبـــانی
ڕاســـت قســـەو گوفتـــار لـــە ڕوو و نیهـــانی
عـــەفـــو و ڕەحمـــەت و دڵ کـــەیلـــی ســـەفـــا
عـــەمـــەڵ بـــە وەعـــدە و ئیســـڵاح و وەفـــا
ڕوشـــد و تـــەوازوع میـــوان پـــەزێـــری
نـــاموس و عففـــەت بـــە برســـی و تێـــری

پۆشینی سرڕ و کۆمەکی بە خەلق
جەودەتی زەکا و عەقلْ و قسەی حەق
عیلم و هونەر و فەزل و ئەمانەت
دین و مرووەت سیلم و مەتانەت
پاکی نیهاد و پۆختی ئەلبیسە
لە فەزائیلیش ئەمەندە بەسە
فەزیلەی ئەخلاق ڕیوایەت وایە
حەسری عەدەدی لە سێسەد دایە
دیارە ڕەزیلەش هەر ئەوەندەیە
چونکە هەریەک زیدێکی هەیە
ڕەزیلەش هەموو بە جارێ یەقین
دەرجە لە نەفسی شەیتانی لەعین
چ لە فەزیلە چ لە ڕەزیلە
مەراتب هەیە ئابەم دەلیلە
مەسەلا سێ کەس سەخاوەت دارن
هەر یەک هەر دارای سێسەد دینارن
یەکێکیان قووەی کەرەمی هەر وا
تا دەوری هەشت نۆ دیناری ئەڕوا
دەرەجەی بەزلی دووهەمیان قووەی
ئەگاتە حەددێ ببەخشێ نیوەی

ئـەنـدازەی سـەخـای سێـهەمیـان وایـە
بـەخشـینی هـەمـووی لا چلـێ کایـە
بـالاتر لـەمـیش هـەیـە بـۆ کـەرەم
نەفسیش ئەبـەخشـێ نـەک تـەنهـا درەم
لـە مـیش زیـاترە هـەر کـەس بتـوانێ
هـیچ هونـەرێـکی لـە خـۆی نـەزانـێ
بەخشـش و وەسـفی بـەخششـی هـەردوو
بـەخشـش خوایـە پێـی ڕەوا فـەرمـوو
وا بـەمـە زانیـت لـە هـەردوو وەسـفا
دەرەجـات هـەیـە لـە قـووە و زەعفـا
جـانۆش کـە شـەربـەت ئیمـانی زەلاڵ
کـەوا برزتـری مـەرتـەبـەی کـەماڵ
ئـەعـلای دەرەجـات کافـەی فـەزائیـل
نوقتـەی نیهایـەت حوسـنی شـەمائیـل
کـالاّن و خـودا بـڕیونی بـە بـەر
بـالای بـێ هـەمتـای (سـید البشـر)
بۆیـە فـەرموویـە حـەزرەتـی عـەلـیم
(إنَّـکَ لَعَلَـی خُلُـقٍ عَظِـیم)
بـەم حـەزرەتـەدا خـالقی بێـچون
ناردوویـە بۆمـان دەسـتوور و قـانوون

## باسی قورئانی مەجید

قوورئـــانی عـــەزیـــم قـــانوونی وایـــە
بـــۆ هـــەرچـــی دەردە ئـــەعـــلا دەوایـــە
بـــەڵام چ ســـەمـــەر کـــە تـــۆ نـــەیخوێـــنی
بـــش خوێـــنی هیچـــی لـــێ نـــەفامێـــنی
بـــش فـــامی دڵـــی بـــۆ نـــەگریتـــەوە
گـــەوهـــەری وون بـــووی پـــێ بکریتـــەوە
دەمـــێ خـــەیـــاڵات دوور بخـــەرەوە
لـــە ڕەفتـــاری خـــۆت بیـــر بکـــەرەوە
خـــۆ ئاگـــات لـــێیـــە لـــە شـــارۆ یـــا دێ
وەخـــتێ کـــە نامـــەی دۆستێـــکت بـــۆ دێ
چـــۆن بـــە گشـــت هێـــز و فکـــری خۆتـــەوە
لـــە کـــەلیمـــاتی وورد ئـــەبیتـــەوە
بزانـــی ئـــاخۆ بـــۆچی نووســـیوە
لـــە ئـــەحواڵـــی کـــێ و لـــە چـــی پرسیوە
تابـــاش تێـــنەگـــەی مـــەتڵـــەبـــی چیـــە
بـــۆ ئیشێـــکیتـــر مـــەجالـــت نیـــە
ئـــەی خـــۆ قورئـــانیش نامـــەی خودایـــە
مـــەوعیـــزە و ئـــەمـــر و نـــەهـــی تێدایە

بـــە پێـــغەمبـــەرا بـــۆ تـــۆی نـــاردوە
بـــۆ لـــە تـــەماشـــای مانـــت گرتـــووە
مەگـەر نامـەی ئـەو شـەخـەسـە لـە لات
خۆشـــەویســـترە لـــە نامـــەی خـــودات
ئـــەوەنـــدە ســـارد و بـــێ ئیهتمـــام بـــی
قسەی ڕاست خۆشـە ناشـێ ئیسـلام بـی
تـــەوجیهـــی خیتـــاب بـــە تانـــە و لۆمـــە
لـە نـەفسـی زاڵـی ئـەممـارەی خۆمـە
ئـەگینـا ئیسـلام[1] هـەرکـامی ئـەگـری
لـــە مـــن چـــاکترە کـــردەوە و فیکـــری
قوورئـان وەک ئـەعـلای هـەمـوو قانوونـە
پـــڕ لـــە حیکمـــەت و عـــیلم و فونوونـــە
نـەقسـە تـەشـبیهی بکـەی بـە دەریـا
سـەد هـەزار دەریـا حیکمـەتـی واتیـا
(لا رطـب ولا يـابس) هـــــەتـــــا
(الا فـــی کتـــاب)[2] وا لـــە ئایـــەتـــا
یـانێ نیـە تـەڕ نـە وشـک کـە بـەیـان
نـەکـرابێ لـە نـاو ئایـەتـی قوورئـان

---

[1] – موسلیم لێرەدا باشترە

[2] – الانعام/٥٩

بـەڵام تـۆ لـە مـە هـیچ دامـەمێـنە
بـەمیشـە ئیمـان وەک بـاقی بێـنە
مـەڵێ لـە قوورئـان نـابینی ئـەمـە
عـومری کـێ زۆرە یـا هـی کـێ کـەمـە
ئـەم ڕزقـە قـازانج بکـا یـا زەرەر
یـا خـۆ کـەی بێـتۆ فـڵان لـە سـەفـەر
عـیلم بـەمانـە هـەروەک مـەعروفـە
موحتـاج بـە زانـین عیلمـی حروفـە
لـە قوورئـان بـەپێـی مـەهـارەتـی خـۆت
لەو عیلمە هەمـوو مـەعلـووم ئـەبێ بـۆت
زۆر شـت کـە قـوڕئـان باسـی کـردووە
تـازە وا عـیلم ڕێـی پـێ بـردووە
عـیلم تـا دەسـتی بـە ویسـعەت بگـات
ئیسـباتی ڕاسـتی ڕیسـالەت ئـەکـات
مـرج البحـرین لـە سـوورەی ڕەحمـان
بخوێـنەرەوە تـا (لایبغیـان)
جـا ئـەگـەر کـوڕی سیرڕی تـێبگـە
وەرنـە زەرەرە ئینکـاری مـەکـە
بـە کـووردی یـانێ دوو بـەحـری واهـەن
بە بێ تێکـەڵ بـوون بـە یـەکتـر ئـەگـەن

بەشەر نەی ئەدێ ئەمە تا وەختێ
هێنایە بەر چاو عیلم هێندەی نەختێ
دەری خست لە بۆ مونکیری دڵ ڕەق
قوورئان فەرموودەی خودایە بە حەق
لە زانایانی(اوقیانوغرافیا)
یانی عولەمای ئەو زاعی دەریا
دەرچوی جامیعەی(کمبرج)بەعسەیە
لەگەڵ عولەمای میسرا دەسەیە
چوونە دەریاوە هەر وەکوو غەوواس
لە بۆ تەحلیل و ناسینی خەواس
لە بەینی بەحری ئەحمەر و هیندی
بەهۆی زانستۆ ئەم عیلمەیان دی
دییان کە یەک ئاو زاهیری حاسە
ئەبینێ، بەلام دووە تەماسە
تەحلیل دەری خست کەوا دوو ئاون
بە خەواس لە یەک فەرق خراون
خواس تەبیعی و هی کیمائی
بە ئیجاب و سەلب بوە بە جیائی
لە بەینیانا کەوابوو مومکین
نابێ بە هیچ جۆر تێکەڵی یەک بن

سرری ئەمەیان لێ بوو بە مەراق
بە هۆی جیهازی (قیاس الاعماق)
دەرکەوت حاجزێ تەبیعی کەمتر
سەر کەوتۆتە سەر لە هەزار متر
بەلام لە بنکۆ تا موستوای ئاو
هەزار و سێسەد متر هاتە ناو
وتیان سەبەبی ئەم حاجزەیە
کە فەرقی ئەم دوو خواسە هەیە
هەم لە خەلیجی عەقەبە و دەریای
سوور عەینی شتیان لە بۆ دەرهێنای
لە(لااقسم)هەتا(بنانە)
بخوێنەرەوە و مەعنای بزانە
مەفهوومی خوا ئەفەرمووێ ئینسان
پێی وایە ئاخۆ وەک ئیستە دیسان
ئێسقانەکانی کۆ ناکەینەوە
یانی حەیاتیان پێ نادەینەوە
با واتێ نەگا نەک ئێسکی کۆکەین
ئەتوانین ڕێکی بەسەر پەنجەی دەین
لە ناو ئەم هەموو ئەعزا کە بەشەر
خودا پێیداوە لە دەروون و دەر

بــۆچی ســەر پــەنجــەی هــەڵــبژاردووە
ئــــەعزایــــەتــــری نـــاو نـــەبـــردووە
ئـەڵـبەتـە زیـاتر لـەوان سـەر پـەنجـە
دارای حیکمـــەت و ئـــەسـرار و گـــەنجـــە
گــەرچـی ئــەسـراری گــەلێـکە ئـەمـا
یـــەکێـــک لـــەوانـــە ئـــەوەتـــە لـــە مـــا
ساڵـی هـــەزار و هـــەشتســـەد و هـــەشـــتاو
چـوار، خـودا ئـەمـەی هێـنایە بـەرچـاو
ڕەســـــمەن بۆناســـین لــــە(انگلتـــرا)
(طبـــع الاصـــابع) ئیســـــتعمال کـــــرا
دەرکەوت ئەنـدامی بـەشـەر هـەموو یـان
ئـەشـوبهێ بـە یـەک لـە چـلا دوویـان
سەرپـەنجـە نـەوەک ناشوبهێـت و بـەس
نزیک نابێـتۆ پـەنجـەی کـەس بـە کـەس
پـەنجـە بـە چـوار نـەوع دروسـت کـراوە
هــەر یــەک بــە نــەوعێ نـاوی بـراوە
یـەکـەم(ئـەقواسـە) دووهـەم(دەووامـات)
سێهەمـین(عـەراو) چـوار(مـورەککـەبـات)
بـێ حیکمـەت نییـە بـۆ خـودا ئـەمـی
لـە نـاو ئـەنـداما گـرت بـە مـوهیمی

تـــەنبیهـــە بـــەوەش لـــە ڕۆژی جـــەزا
بـــێ تۆڵـــە نیـــە شـــەهـــادە و ئیمـــزا
تـــا تـــەواو عـــیلم تـــەوەسســـوع نـــەکـــا
کەم کەس لە مەعنای قوورئـــان تـــێ ئـــەگـــا
نـــەسســـی کـــەلامـــی حـــەق تـــەعالایـــە
ئـــەوەی مـــەوجـــوودی پـــەســـت و باڵایـــە
هـــەمووبـــان ئـــەکـــەن بـــۆ خـــوا تـــەســـبیح
(وَ إنْ مِـــــنْ شَـــــیْیءٍ اِلاّ یُسَـــــبِّح)
هەندێ موفەسسیر وای تـــەفسیر ئـــەکـــرد
ســـەری حـــاڵ ســـوجدەی ئینقیـــادی بـــرد
وا تـــازە ئـــەمـــڕۆ عـــیلم ئیســـباتی کـــرد
مـــەوجـــوودات هـــەمـــوو چ گـــەورە و چ وورد
تـــەواو جـــەمـــاد و ســـەوزی و بـــەهـــائیم
زەرراتـــی جســـمیان ئـــەبـــزوێ دائـــیم
بـــێ ئـــەوە کـــە چـــاو ئـــەمـــە حـــس بکـــات
یـــا دەرکـــی بـــاقی حاســـەی پـــێ بگـــات
کـــە زەررات ئیســـبات کـــرا حـــەرەکـــەی
ئینکـــاری زیکـــری دەنگـــی چـــۆن ئـــەکـــەی
مـــوعجزەی عیلمـــی ئایـــاتی قوورئـــان
زۆر زۆرە هـــەروا نایـــەتـــە بـــەیـــان

ئـەممـا هـەمـوو کـەس نیـە لایـەقـی
ئـــەوەی کـــە بگـــا بـــە حـــەقـــایقی
مـەر لـە ڕەزیلـە و مـەعسـیەت پـاک بـێ
لـە خـوا ناسـیا لـە عالـەم تـاک بـێ
وەک لە بێ دەستنوێژ مەمنووعە مـەسسـی
بـە ئـەهلـیش نـەبـێ نـادری دەرسـی
قوورئـان ئـەوەنـدە شـەئنـی جـەلیلـە
لـەم عـەسـرەش کـەوا ئیسـلام زەلیلـە
لـە نـەشـری ئـەحکـام بـێ ئیقتـدارە
موسوڵـمان خۆشـی لـە خـۆی بێـزارە
خـوا بـە وەسـیلەی ئیزاعـەی ڕادیـۆ
لـە ڕوومـا و بـەرلـین پـاریس و توکیـۆ
عاسـمەی دوەل هـەمـوو قـاڕڕەکـان
نـەشـر ئـەکـا بـە نـاو عالـەمـا قوورئـان
سـەنـەدی بیسـتن لـە گشـت ئـەسێـنێ
تا سبەی هیچ کـەس عـووزری نـەمێـنێ
خـودا مـورادی نـەشـری قوورئانـە
غایـەی ئـەوانـیش کـەیفـی خۆیانـە
تـا بلێـی قوورئـان ئیعجـازی زۆرە
نومایـان هـەروەک شـوعاعی خـۆرە

سەیری ئەسراری ئەم قوورئانە کە
تەماشای حیفزی ئەم قەڵغانە کە
بیست و پێنجی مانگ لە ڕەمەزانا
مورشدی کامڵ عارفی زانا
حروفی حساب ئەکا بە ئەبجەد
نەتیجەی جەمعی بگاتە هەرچەند
لە سەر کاغەزێ تەرتیبی ئەدا
چوار خانی وفقی لێ دروست ئەکا
لەگەڵ ئەنجامی ویرد و شرووتی
بخرێتە بەرگی خوێ بە مەزبووتی
ئەوە بە هەر کەس بێ وەختی جەنگ
ئیتر ئەمینە لە گوللەی تفەنگ
ئەو گوللە بەندە سوپەرێ وایە
سەد گوللە لێیدا هیچی لێنایە
زۆر دەفعە بووە لە بۆ ئیمتحان
کراوەتە مل مریشک و حەیوان
ئەوەندە گوللەی لە سەر باریوە
ئەغڵەب پەڕ و مووی لێ هەڵوەریوە
بەو هەموو گوللە لێیان دراوە
قەترەیە خوێنیان لێ نەبینراوە

جێـی حیـرەت نیـە کـەلامـی خوایـە
ئـەگـەر وا نـەبـێ حـەیـرەت لـەوایـە
بـەڵام لـەم ڕۆدا لای هـەنـدێ وایـە
تـەئسـیری دۆعـا بـە هـۆی بڕوایـە
مەسەلـەن ئـەڵێـن هـەر عـەقیـدە خـۆی
بـەو گـوللەبـەنـدە هـۆی نـە بڕینـە بـۆی
ئـەڵێـم ئـەیکـەنـە ملـی حـەیـوانێ
حەیـوان عـەقیـدەی بـە نـەبـڕین کـوانێ
دیسـان ئـەزانـێ عـەقیـدە چیـە
جـەزمێـکە شـک و وەهمـی تیـا نیـە
کـە ئیمتحـانی گـوللەبـەنـد کـرا
مـەعنـای ئـەوەیـە شـکی تیابـڕا
دووبـارە هـەتـا جـەمعـی یـەک نـەگـرێ
کەمتر تـەجروبـەی گـوللەبـەنـد ئـەکـرێ
جـا لـەو کۆمـەڵا یـا یـەکـێ یـا دوو
بڵێـن عـەقیـدەی بـەو دۆعایـە بـوو
بـاقی تـر یـاخۆ بـە شـک پێـی وایـە
نایبـڕێ وەیـا هـەر بـێبڕوایـە
کـەوا بـوو ئیتـر عاقیـە و یـەقیـن
هـۆ نیـە لـە بـۆ بـڕین و نـەبـڕین

گــەر عینــادی مــەحــز لــە دڵا دەرکــەی
زەریف لــە مــەعنــای قورئــان نـەزەرکـەی
ئــەبینــین کــە هــیچ چاکــە نــەمــاوە
ئــیللا بـــە فیعلـــی ئـــەمـــر کـــراوە
وەیـــا نـــابینی هـــەرچـــی خـــراپ بـــێ
بـە سیغەی تـەهدیـد مـەنـع نـەکـرابێ
خۆلاسـەی قورئـان ئـەمـر بـە بـەشـەر
ئـەکـا بـە کـەسبی فـەزیلـە و هونـەر
جـا کـە تـۆ بێـزار لـە فـەزائیـل بـی
ئـەبـێ بـە خـولقی شـەستان مایـل بـی
چونکـە وەک وتمـان ڕەزیلـە هـەمـوو
دەرجـە لـە نـەفسـی ئیبلیسـی بـەدخـوو
قورئـان ئـەیـەوێـت لـەوت دوورخـاتۆ
بـە ئـەخـلاق الله نزیکـت کـاتۆ
دیسـان ئـەفـەرمـووێ ئـەبـێ بـۆ ئـەوە
کـە بـۆی دانـاوی ئـەم ڕۆژ و شـەوە
لـە چـۆڕێ ئـاوی نـاپوختی نـابوود
بـەم شـکڵ و عـەقڵـە هێـنایتیە وجـوود
لە ئـەسپابی ژیـین هـەرچیـت پـێ‌ئـەوێ
پێـی‌داوی پـەکـت لـە هـیچ ناکـەوێ

ئەبێ لەشوکری سستی نەیەنی
ڕەسمی بەندەگی بۆبەجێبێنی
هەموو ڕۆژ و شەو بۆ زیکر و سەنای
حازربی پێنج جار ڕووکەیتە درگای
بەرلەوە بڵێی(الله اکبر)
خەیاڵات لە دڵ گشت بکەیتەدەر
ئەبێ وا ئەدەب جەمبێ لە دڵتا
تا سەلام خشوع هەربێ لە گەڵتا
ڕێی نەدەی غەیری جەلالی باری
بەودا خەتەرەی تر بکا جاری
ئەبێ کە (الله) لە دەم دەربێنی
بە(اکبر) بتی هەوا بشکێنی
وەختێ (وَجّهتُ وَجْهِیَ)ەت ڕاسە
کە دڵ لە خزمەت(اِلە الناس)ە
وەرنە (وَجّهتُ)ی قیبلەت بەتاڵە
چوون جیهەت لەبۆ خودا مەحاڵە
ڕووی‌دڵ لە بازار تەن لە بەرد و دار
ئەی چ ڕوویەکتە لە پەروەردگار
ئەبێ ئەو نوێژە وا بەجێ بێنی
کەوا بزانی خودا ئەبینی

کــە مــومکین نــەبــوو تــۆ ئــەو ببینــی
ئــەو چــاک ئــەبینــێ تــۆ بــە یــەقینــی
زیللـــەتـــی تـــەواو بێـــنە بـــەرەوە
ســەرت لــە ئــەسڵــی خــۆت بــدەرەوە
ئــەمانــەت کــە بــاش هــات بــە دەســەوە
الله اکبـــر بڵـــێ و هـــەڵســـەوە
کاتێــکیش ســەلام ئــەکــەی لــە نــەبــی
حــازرە حــەزرەت لێــی غــافڵ نــەبــی
لــەغــوە ئــەو نوێــژە گــەر ئــەو جــەنابــە
حــازر نــەبــێ چــۆن کــافی خیتابــە
تاعــەت بــۆ خــودا بــەم جــۆرە ئــەڵــبەت
سەبەبــی خــەوفــە لــەگــەڵ مــەحــەببــەت
خۆ مــەحــەببــەتــیش غایــەی ئــەهــەممــە
چــون باعیســە بــۆ حوســنی خاتیمــە
خــودا بــە حــەققــی ئــەســما و ســیفاتت
بــە قــودســییەت و بــێمیســلی زاتــت
لــە هــەرچــی دەرد و غــەشــێ لــە دڵا
هــەمــە نــەجــاتم بــدە یــا الله
لە شەڕی بەدەن و نەفــس و دڵ هــەمــووم
بــۆ بپارێـــزە یـــا حـــی یـــا قیـــوم

غـەیـری ڕەحمـی تـۆ هـیچ چـارەم نییـە
گــەر لوتفــت نــەبــێ عــیلاجم چیــە
تێــفکرە مــەعنــای قوورئــانی عــەزیــم
یــەعنـی کـەلامـی ئـەقـدەسـی عـەلـیم
بـە پـەیکـی ئـەسـرار نـازڵ بوتـە سـەر
مەتلەعی ئـەعـلای تـەجـەلـلای ئـەکبـەر
بــەحــری زەخخــاری وەقــار و تــەمکــین
بــەدری فــەلــەکـی عیرفــان و یــەقــین
بـەلیـغ‌تـری گشـت فوسـەحـای عـەرەب
مـەنبـەعـی حـەیـا و عیففـەت و ئـەدەب
سەرچاوەی جـوود و سـیدق و سـەماحـەت
سـاحبی حوسـنی خـولـق و مـەلاحـەت
کــانی کـــەرەم و فـــەقیــر نـــەوازی
ســەرداری عالــەم شــاهی حیجــازی
خــەزنـەی جـواهیر ئـەو سـافی کـەمـاڵ
شەمسـی دائیـرەی شـەوکـەت و جـەمـاڵ
میحـــوەری عولـــوم قـــوتبی دارەیـــن
(عــروة الــوثقی) بـــەدری منـــارەیـــن
نوقتەی ئەقسـای سیڕ ئـەربـابی شـهوود
خــەتــی وەســەتــی دائیــرەی وجــود

(دَنیٰ) بە تەکمیلٚ مەعریفەت (فکان)
قابی دوو قەوسی وجوب و ئیمکان
(موحەممەد)نووری بینایی ئادەم
واستەی ئیخراج وجود لە عەدەم
لێزمەی باران ڕەحمەتی خودا
بە سەریا دائیم بڕژێ لە سەردا
ئەگەر ئەتەوی زۆر باش بزانی
ئەخلاقی گەورە و ڕەوشتی جوانی
هەر لە ئیبتدا ئایەت بە ئایەت
قوورئان بخوێنە هەتا نیهایەت
ئەو جارە ئیتر لەلات عەیانە
کە ئەخلاقی ئەو عەینی قوورئانە
چوون نابێ کەسێ ئەمری تەبلیغ کا
عەمەلٚ بەو ئەمرە لە خۆی درێغ کا
خوسوسەن قوورئان چاک لۆمەی ئەکا
کەسێ بە چاکە ئەمرکا و نەیکا
(اتامرون) تا (انفسکم)[1]
ببینە و مەعنای لە خۆت مەکە گووم

---

[1] - البقره/٤٤

جا تۆخوا کەسێک خوێندنی هەرگیز
نەبوبێ لە لای مامۆستا و (تلمیذ)
باوک و دایکیشی هەر بە منالی
جەهانیان لە ژین کردبێ خالی
لە گەورەییدا زاتێکی وابێ
موئەددەب تری گشت (ماسوی)بێ
کەلامێکی وا ئێعجاز بنوێنێ
بە سەر ئینسان و جیننا بخوێنێ
گەلی فوسەحا و شوعەرای عەرەب
عولەمای لوغەت لە شەرق و لە غەرب
هیچ کام نەتوانن سوورەتێ تەنیا
دروس کەن هەر وەک (انا أعطینا)
خودا بۆ خوشی بفەرموێ ئەگەر
ئینسان و جننی کۆبنۆ یەکسەر
با بۆیەکتریش ببنە پشتیوان
ناتوانن بێنن بە وێنەی قوورئان
وازبێنە لەوە کە موسوڵمانە
بڕوانە لە بۆ مەدحی بێگانە
(دیر مانجیم) ئەڵێ ئەبێ پێغەمبەر
موعجزەی ببێ شاهد بێ لە سەر

ڕاستی دەعوای ڕسالەتی خۆی
چونکە بێ ئیعجاز سابت نابێ بۆی
جوانی ئەدەبی زۆر بەرزی قوورئان
بەو گشت نوورەوە مەتەڵێکی وان
تا ئیستە بۆ کەس هەڵنەهاتووە
نوتق لە حەقیا یەکی کەوتووە
لە بۆ موحەممەد یەکەم ئیعجازە
کە وێنەی نەبوە و نابێتۆ تازە
تەحەددی کردووە لە گەڵ ئینس و جن
گشتیان وەک ئەمە ناتوانن بێنن
بە مەعنای کامڵ ئەبی بە بوورهان
بۆ ڕسالەتی موحەممەد قوورئان
(سیل) ئەڵێ قوورئان گەیشتووە تەرزی
جوانی و فەییازی بە ئەعلای بەرزی
وەختێ ئایاتێ تیلاوەت ئەکرێ
زیهنی گوێگران گشت بە دیل ئەگرێ
حەتتا ئەو کەسەش کە پێی مونکیرە
چاری هیچ نیە پێی ئەڵێ سیحرە
بێگانە زۆریان هەروا تێ ئەگەن
ئینساف ئەدەن و ئیعتراف ئەکەن

تۆش ئینساف بدە و ڕێگەی حەق بگرە
لە گەڵ دیققەتا باش تێبفکرە
کەسێ میزاجی سەفراوی نەبێ
قابلی سەعی و تەداوی نەبێ
نازانێ کە ئەم شیرین ئەوسافە
ئەم بەحری جوود و عەفو و عەفافە
ئەم کانی سیدقە ڕەسولوڵڵایە
قوورئانیش وەحیی حەق تەعالایە
بەڵام کام ئاوە خۆش و زووڵاڵە
لە دەم نەخۆشا ناخۆش و تاڵە
ئەم شەوق و حوسنە کە ڕۆژ پێیەتی
شەمشەمە کوێرە ڕقی لێیەتی
قائیدی هەر کەس (کلام الله) بێ
مەحاڵە هەرگیز تووشی بەڵا بێ
خودا بە حوکم و حیکمەی قوورئان
کە ناردوتە بۆ گرۆی ئینس و جان
لام بدە لە هەر خویە زەمیمە
(اهدنا الصراط المستقیمَ)
ڕێگەی ئەوانە مەستی نیعمەتن
نەک ڕێی ئەوانە پەستی لەعنەتن

بمخــەژێــر لیــوای ئــەو فــەلــەک ســایە
کــە کــەون نــەدەبــوو گــەر ئــەو نــەبوایــە

## بەیانی شەرەفی نەوعی ئینسانی

وە سیحەتی حەدیسی قودسی

## (لولاک لولاک لما خلقت الافلاک)

بــرام نــەفســەکــەت ئــەگــەر ئــەپرســێ
چۆن دروست بوو کەون بۆ تەنهــا کــەســێ
بزانــە عالــەم مــەعقــول و مــەحســوس
مــەقســودە لــەبــۆ حــەزرەتــی (قــدوس)
ئــەجرامــی علــوی و ســوفلی هــەموویــان
مەعلــوم جــەمــادن بــێحــیس و بــێ گیــان
لــەبــۆ خزمــەتــی نــەبــات و حــەیــوان
دایــم خــەریکــن ئــەجــڕام هــەموویــان
فــەرزەن گــەر جــەمــاد تــەرەقــی بکــات
شــەئنــی بــە روتبــەی نــەبــادات ئــەگــات
ئــەممــا گــەر تــەڕفیــع بکــا نــەباتــات
پایــەی ئــەگاتــە شــەئنــی حــەیوانــات
کــەوابــوو ئــەجــڕام چونکــە بــێدەرکــن
لــە قــەصدی بالــذات بــۆ خــودا تــەرکــن

غـەرەز لـەم علـوی و لـەم سـوفلی‌یانـە
لـەبـەر خزمـەتـی سـەوزی و حـەیوانـە
دیسـان ئـەبیـنن جینسـی نـەباتـات
نەرۆحی هـەیـە نـە هـیچ حـیس ئـەکـات
ایجـادی لـەبـەر قـووتی حـەیوانـە
یـا لـەبـۆ دەوای دەردی ئـەوانـە
کـەوابـوو ئـەویـش مقصـودی بالـذات
نـەبـوو بـۆ خـودای زەوی و سـەمـاوات
حەیـوانیش هـەمـوو بـەغـەیـری ئینسـان
لـە قـەصـدی بالـذات خـاریجن دیسـان
چوون هەرچـەنـد ئینسـان حیسـی تێدایە
بـەڵام لـە (حسّـی حـسّ)بـێ ئاگایـە
دەستی بەشـەریـش بـە گشـتی ئـەگـات
ئـەنـواع تسـەروف لـەوانـا ئـەکـات
کەوابوو مـەقسـوود لـەم گشـت ئێحسـانە
لـەبـەر خـاتری نـەوعـی ئینسـانە
سـەبـەبـی خـەلقـی ئینسـانیش یـەقـین
عیرفانـە بـە زات رب‌العـالمین
حـەدیسـی قودسـی(خلقـت‌الخلـقَ
لکـی اعـرف)مـەعلوومـە حـەقـە

چون ئەگەر لەبەر خەوو خواردن بێ

تا بەینێ ژین و دوایی مردن بێ

چ فەرقی ئیتر لە گەڵ حەیوانە

فائیدەی چی بوو ئەم خزمەتانە

هەور و با و فەلەک مانگ و ڕۆژ تەواو

خەریک بن تا تۆ ژینت دێتە ناو

تۆش هەر بۆ ئەوە بخۆی و بمری

کەوابوو داری دڕکی بێبەری

مادام بێکەڵک و موزڕڕ و زڕی

لایەقی لوقمەی بڵێسە و گڕی

بە فەرموودەی خوا مەوجوودات برا

خەلقی هیچکامی بە گاڵتە نەکرا

(وما خلقت الجن و الإنس)

تەفسیری لەلای زانا بپرسە

لای ئەهلی قوورئان(لیعبدون)

تەفسیر کراوە بە(یعرفون)

ڕێی مەعریفەتیش تەرکی هەوایە

حوسنی عیبادەت وەرع و تەقوایە

دروستی نەکرد ئەجیننە و ئینسی

ئیللا بۆ ناسین زاتی ئەقدەسی

کە وابـوو مـەقسـود لـە خـەلقـی ئینسـان
بـۆ مـەعریفـەتـە بـە زاتـی یـەزدان
خـۆ مـەعـارفیش بـەحرێـکی وایـە
سـاحلی نییـە و ئینتهـای نایـە
ئـەممـا دەرەجـات لـەوا بـۆ ئینسـان
هـەیـە بـە گوێـرەی زیـادی و نوقسـان
ئـەنبیـا و زومـرەی ئـەولیـا هـەر یـەک
تـەشـریف کـراون بـە مـەرتـەبـەیـەک
هـەرکـامێ ئـەگـری لـەو بوزورگانـە
نـەهـەنگـی قـەعـری بـەحـری عیرفانـە
هەریـەک بـە قـەدەر مـەعریفـەتـی خـۆی
ئـەسـراری قودسـی مونکـەشـیفە بـۆی
گـەورەیـیش لـە نـاو ئـەو ئـەشـرافانـە
بـە پێـی ویسـعەتـی عـیلم و عیرفانـە
مەقسودی ئەسڵیش لـە گشـت ئـەشـیایە
ئـەعلاتریانـە بـە ڕوتبـە و پایـە
هەروەک لە سەدا گشت ئەعدادی پـەسـت
هەیە وەکوو سی، پەنجا، نـەوەد، شـەسـت
ئینجـا بـە علـم الیقـین بزانـە
ئـەرفـەعـی هـەرچـی ڕوتبـەی ئێحسـانە

ئـــەقســـای دەرەجـــات لـــە مـــەعاریفـــا
عـــەتـــای فـــەرمـــووە خـــوا بـــە موســـتەفـــا
یـــەعنـــی موحـــەممـــەد ســـید البشـــر
شـــاهی کـــەونـــەیـــن و شـــافعی مـــەحشـــەر
وا دەرکەوت تـــەنهـــا هـــەر مـــەعـــاریف بـــوو
کە قەسدی بالـــذ ات لـــەوا صـــاریـــف بـــوو
بـــالتبع لـــە بـــۆ ئـــەجـــرام و حـــەیـــوان
قـــەســـد و ئیـــرادە صـــادر بـــوو بۆیـــان
ئیتـــر کـــە جـــەمـــاد لـــە بـــەر نـــەبـــات بـــێ
نـــەباتـــات خۆشـــی بـــۆ حـــەیوانـــات بـــێ
خـــەلقـــی ئـــەوانـــیش لـــە بـــەر ئینســـان بـــێ
ئینسانیش لـــە بـــەر کـــەســـبی عیرفـــان بـــێ
فـــەردی کاملّـــیش لـــە ئـــەهلـــی عیرفـــان
رســـول الله بـــێ بـــێشـــوبهە و گومـــان
دیـــارە لـــە بـــەر ئـــەو حـــەزرەتـــی مـــەننـــان
هێـــنایە وجـــود ئـــەرز و ئاســـمان
ســـەحیحـــە بـــێ شـــک خیتـــابی (لـــولاک
لـــولاک لمـــا خلقـــت الافـــلاک)

**تەقسیمی موجود بە مەحسوس و غەیرە**

**وە ئەدیللە لە سەر وجودی کائیناتی غەیرە مەحسوسە**

ئــــەنــــواعی زۆرە مـــەخلـــوقی خــــودا
زاتەن و وەســفەن گشــت لــە یــەک جــودا
هــەر شــکڵ و ڕەنگـــی ئینســـان بیـــەوێ
لــە خــەزنــەی کــەونــا دەســتی ئــەکــەوێ
قیســمێ لــە مــەوجــود ئــەونــە لــەتیفــە
قـــووەی حـــس لــــە بـــۆ دەرکـــی زەعیفـــە
وەک مـــــەلائیکـــــە و ئـــــەرواح و جننـــــی
یاحاڵـــــی قـــــەبـــــر کـــــەنایـــــان بینـــــی
بـــەعزێـــکیش پـــڕی جســـمی وەهایـــە
حـــەواس لـــە دەرکـــی بـــەشـــی تێـــدایە
جۆرێـــکیش لـــە گـــەڵ هـــەر دوو شـــەریکـــە
بـــــەڵام بـــــە لایـــــەک تـــــەواو نزیکـــــە
لتافـــەتـــی ئـــاو هـــەرچـــەنـــد مـــەشـــهوورە
لـــە قیســـمی لـــەتیـــف ئیشـــتاکوو دوورە
تـــەواو نزیکتـــر بـــە لـــەتیـــف وەک(بـــا)
کـــە جـــار جـــار حوشـــتر بـــە بـــارۆ ئـــەبـــا
دەمدەمـــیش ئـــارام بـــێ ســـروە و دەنگـــە
چـــاویش ئـــەکـــەیتـــۆ بـــێ شـــکڵ و ڕەنگـــە

ڕەنگــە بپرســی لــەو فیرقــە کــەوا
بــە جــنن و مــەلــەک نیانــە بــڕوا
بلێی ڕاست ئـەکـەن ئـەڵێـن هـەیـە(بـا)
جوابــت بــدەنــۆ بــە نــەفــی و ئیبــا
ئــایینی وایــە هــەرچــیٚ نــەبیــنن
ئیمــان بــە بــوونی ئیتــر نــەیــەنــن
دوێ کەس نەیئـەدی وجـوودی میکـرۆب
وا ئێســتە دەرکــەوت بــە میکرۆســکۆب
(تەنویمیش)لـە بـۆ مـاددی ئیسـبات کـرد
کە بەشـەر تـەنها هـەر بـەشـەرەی مـرد
وەیـا لـە خـەویـا کـەسـیٚ ئـەخـەوێ
لـە خـەویـا ئـەڕوا پێـی هـەڵ ئـەکـەوێ
هەڵ ئـەسـیٚ ئـەڵـیٚ ئێسـتا کـە خـەوتـم
وامزانــی لــە ســەر بانێــکۆ کــەوتــم
یاخۆ لـە خـەومـا لـە سـەیـری بـاغ بـووم
مەسروور و خۆشحاڵ خـاوەن دەمـاغ بـووم
ئــەو کــەســەش کــەوا لایدانیشــتوە
ئــەبینیٚ کــە ئــەم شــەخســە نووســتوە
هــەر وەکــوو مــردوو بــیٚدەنــگ و باســە
حــەرەکــەی نــەبــوو غــەیــری هــەناســە

بڕوای بەم هەیە و مونکیرە بەوە
نازانێ مردن کە برای خەوە
جەواهێر بێ حەد لە کەنزی کەونا
مەوجوودە و بێ بەش لە شکڵ و لەونا
کێ ئەیوت هەوا تەئسیری تیایە
کە هەوا خۆشی لە بینین نایە
کەوا بوو ئیتر ئینکار بێ سوودە
زۆر شت نابینرێ کەچی مەوجوودە
عەلاوە زۆر کەس لە کاتی وەفات
لە پڕ سروور و خۆشی بۆ ئەهات
ئەی وت وا چرای کەرەم هەڵکرا
جێی خۆم لە بەهەشت پێ نیشان درا
نە خۆشی وتی موژدەم درایە
دووسبەی جێگەت ئەو دنیایە
ئەم بەشارەتەی زۆر لەلا خۆش بوو
هەر بەو میعادەش لە دنیا دەرچوو
یا لە مردندا شەخسی وەها بوو
ئەیوت(علیک السلام) بفەرموو
ئالەم نەوعانە زۆر واقیع بووە
کە وەختێ فەوتی بەیان کردووە

دەفعەیە شەخسێ لە نەخۆشیدا
شەو بوو لە عەینی هۆش و خۆشیدا
مەجلسی دەوری کردنە دەرەوە
ئەیوت با میوان بێنە بەرەوە
پاشتر عەینی شەو بانگ کرانەوە
بە ئیلحاحی زۆر بۆی گێڕانەوە
وتی ئەوانە تەشریفیان هاورد
لە ئەهلی عیسیان نەفرەتیان ئەکرد
دوای ئێوە هاتن منیش بێ‌پرسین
ئەوانم یەک یەک هەموو ئەناسین
وتیان ماڵی تۆ ئەونەی نەماوە
سبەی خۆر بدا لە کەژ تەواوە
لەگەڵ تەواو بوو لێرە کۆچ ئەکەی
بە قەسری باغی بەهەشتت ئەگەی
شەو تا بەیانی تا کاتی هەتاو
ئەی پرسی لە بۆ سەعات ناو بە ناو
هەتاو کە وەختێ دای لە شاخ و گرد
شەهادەی هێنا و خواحافیزی کرد
جارێ چەن کەسێ بۆ سەفەر ئەچوون
بۆ خەوتن شەوێ تووش چۆڵیە بوون

یەکێکیان هەستا لە عەینی شەودا
وتی هەر ئێستە بینیم لە خەودا
لە پڕ گرمەیە هاتو دوای ئەوە
کەوتمە ناو باغێ خۆش ئەوزاعەوە
نەهر و ئاوێ خۆش تالاری عالی
جێگەیە وابوو نەبوو ئەمسالی
لەوا بوو کە خەو بەیانکا بۆیان
لە پڕ بەر شلیک دران هەموویان
ئەو جەماعەتە هەر مەبەلەغێ بوون
بە سەلامەتی هەموویان دەرچوون
ئەو شەخسە ئیشتا گەرمەی قسەی بوو
گوللەیە لێیدا و زوو ڕۆحی دەرچوو
دیسان عادەتی ملووک وەهایە
کەم کەس لە ئەسرار ئەوان ئاگایە
مەگەر هەر دەسەی وزەرا و ئەعیان
ڕێیان بێ جار جار بچن بۆلایان
بۆ باقی مەمنووع لەگەڵ ئەویشا
هەر عونسورێکن بێنەوا و پاشا
ئەی تۆ تەماتە بەم قوسورەوە
بەم جەهل و خەتا و گشت غورورەوە

بزانــــی ئــــەســــرار خودایـــــە کـــــەوا
موحتـــاجی ئـــەون شـــاه و بـــێ‌نـــەوا
یـــا لـــەبـــۆ مـــن، تـــۆ، بێنێـــتە وجـــوود
پایـــەی حـــوزور و مـــەقـــامی مـــەشـــهوود
شـــەرەفـــی حـــوزور زانینـــی ئـــەســـرار
خاسســـی خـــەواســـە و ئـــەولیـــای کیبـــار
میســـلی فریشـــتە و ئـــەحوالـــی قوبـــوور
یـــا لـــە مـــەغیبـــات ســـائیری ئومـــوور
لـــە قیســـمی ئـــەســـرار ئـــەدەســـی شـــاهین
لـــە مـــەخسووســـاتی عیلمـــی ئیلاهـــین
وەلاکـــین بـــەعـــزێ عیبـــادی کیـــڕام
تـــابعی ئـــەخـــلاق ســـیدالانام
بـــە عیلمـــی(لـــدن)لـــە لای خـــداوە
بـــەعـــزێ ئـــەســـراریان بـــۆ دەرخـــراوە
لازمـــە لـــەســـەر شـــەخســـی موسوڵـــمان
ئیمـــان بـــە هـــەمـــوو ئایـــەتـــی قوورئـــان
ئـــەبـــێ بـــاوەڕمـــان بـــبێ مـــەلائیـــک
هـــەن بـــێ نێـــر و مـــێ بـــێ بـــاب و دایـــک
بـــێ خـــەو و خـــواردن ئـــەژیـــن و ئـــەمـــرن
هـــەمـــوو لایـــعصـــو ن مـــوتیعی ئـــەمـــرن

بــەعــزێ بــە تاعــەت ڕوخســەت دراوە
قیســـمێ ئومووریـــان تـــەفـــویز کـــراوە

## بەیانی هۆی کەهاڵی لە بەجێ هێنانی فەرمانی خوا

بە سروەی سەبـای فکـری حـەقـق بـۆ دڵ
غونچەی مەعریفەت ئـەپشـکوێ بـە گـوڵ
بەڵام بە سـەبـەب عیشـقی ئـەم نـەفســە
بـۆ جیفـەی دنیـا لـەو خێـرە حـەبســە
چونکـــە مـــەشــــهوورە دڵ هـــەر دڵێـــکە
مـــەربـــوتی ڕوشـــتەی عیشـــقی گوڵێـــکە
ســـایری ئـــەشـــیای لـــەلا مـــەعدومـــە
خـۆی لـە خـۆی فـانی بـە کـوردی گومـە
وا بـــەو داوەوە هـــەتـــاکوو ئـــەمـــرێ
کـــە مـــردیش خـــاوەن دڵ لێـــی نـــابووری
هـــەیـــە عاشـــقێ ســـکەی دینـــارە
بـــــۆ کۆکردنـــــەوەی دڵ برینـــــدارە
مـــەحبـــووبی بـــەعـــزێ حـــەیـــوان داریـــە
بـــۆ بزنـــە شـــەلـــێ دەردی کاریـــە
بـــەعـــزێ تـــالبی شـــەئـــن و عیـــززەتـــە
تـــا مـــاوە بـــەشـــی داخ و زیللـــەتـــە

بـــەعـــزێ راغبـــی هێســـتر و کـــەرە
قســـمی (مـــروج) فیعلـــی مونکـــەرە
تـــاقمێ عیشـــقی وا لـــەگـــەڵ پیشـــە
هەرکەس مەجنـــوونی لـەیلـی یـەک ئیشـە
دڵ کـــە لـــە حـــوببی ئـــەمانـــە پـــڕ بـــێ
ئـــەبـــێ لـــە بـــەری مـــەعریفـــەت زڕ بـــێ
چونکـــە جامێـــکت کـــە پـــڕ کـــرد لـــە دۆ
جێـــی شـــتیتـــری تێـــدا نابێـــتۆ
لـــە لای ئـــەوانـــە ئـــەهلـــی عیرفـــانن
هـــۆی بـــێ فـــەرمـــانی ئـادەمـــی دوانـــن
سەبەبی هەردووش هـەنـد بـێ فـەڕییـە
سـەبـەبـی گـەورەی ئـاخر شـەڕییـە
یـــەکێـــکیان شـــکە بـــە بـــوونی میعـــاد
(نعـــوذ منـــه بـــرب العبـــاد)
یـــەکێ تریشـــیان عـــەلاقـــەی قـــەوی
بـــە مـــاڵ و جـــاه و ئـــەمـــری دنیـــەوی
وەکـــوو ئـــەوانـــە کـــە ناومـــان بـــردن
بـــۆ مســـاڵ باســـی بـــەعزێـــکمان کـــردن
دەوا بـــۆ هـــەردوو تـــەرتیـــب دراوە
بۆیـــان لـــە شوشـــەی میســـال کـــراوە

## بەیانی دەوای نەخۆشی تەڕدید

(اعاذنا الله منه بفضله و رحمته) آمین

بـۆ ئـەوەی کـەوا خـەسـتەی تـەردیـدە
لـە دڵـیـا کـزە نـووری عـەقیـدە
ئابـەم میسـالە بـا عیبـرەت بگـرێ
نـەوا کوتوپـڕ بـەو دەردە بمـرێ
شـەخسێـکی برسـی چـووەوە بـۆ مـاڵ
کەسی تیـا نـەبـوو غـەیـری یـەک منـداڵ
بینـی کـە یـەک زەرف پـڕ لـە تـەعامـە
تـەعـامی زەریـف خـۆش بـۆن و تامـە
ئیشتیهای نەفسـی غـەڵـەبـەی لـێ کـرد
چـووە پێشـەوە دەسـتی لـەبـۆ بـرد
لـە پـڕ ئـەو تفڵـە بـانگی کـرد مـەخـۆ
خـواردنی ئـەوە زەرەرە بـۆ تـۆ
وتـی بـۆ وتـی ئێسـتە کـە یـەک مـار
هـات سـەری تێـنا پـڕی کـرد لـە ژار
جاقـەت وەهمـی کـەس بـۆ ئـەوە ئـەڕوا
ئـەو شـەخسـە ئیتـر لـەو نانـە بخـوا
نەفس حەبسی ئـەکا بـەو برسێـەتـی‌یـە
ئـەڵـێ لـەم چێشـتە چـەشـتن شێـتی‌یـە

هەر چەند کە قسەی ناموعتەبەرە
بەڵام بۆ ژینم جێگەی خەتەرە
درۆکا زەرەر هەر نەخواردنمە
ئەگەر ڕاستیشکا ترسی مردنمە
ئەی خۆ یەکسەد و بیست و چوار هەزار
پێغەمبەر هەموو ڕاست قسەو گوفتار
کە بۆ دوژمنیان مەعلووم بوو ئەمە
مەدحی ئەخلاقیان تا بکەی کەمە
لە مەعریفەتا بەحرێ بوون بێ پەی
لە کەماڵاتا کەس پێیان نەگەی
هەموو فەرموویان خودای تەعالا
موحاسەبەی خەلق ئەکا لەمەولا
شک نیە کە دێت ساعەتی دەستور
بە وەعدەی(اذا نفخ فی الصور)
ناقورکە سەدای ئیحیا هەڵبێنێ
مردوو لە قەبرا ڕائەپەڕێنێ
جاهەرکەس وەفقی دەستووراتی ئەو
نەجووڵایێتۆ بە ڕۆژ و بە شەو
یا بە قانوونی ئەو نارازی بێ
لە ئیشی خۆیا هەر خۆی قازی بێ

لە ناو ئەو جەمعا ڕوویان ڕەش ئەکا
عەزابی سەختیان بۆ بەش بەش ئەکا
پەنا بە لوتفت ئەگرم ئیلاهی
لە هەوڵی حەشر و لە ڕوسیاهی
تەسلیمیان ئەکەن بە زەبانی یە
کە هیچ وەک ئەوان غەزەب ناک نی‌یە
لە قەهر و غەزەب دروست کراون
بۆ عەزابی سەخت تەرتیب دراون
یەک زەڕڕە ڕەحمیان نەچووە بە لادا
خودا بە ڕەحمەت لەوانمان لادا
ڕوو گرژ و عەبوس هەموو ڕق ئەستوور
هەیکەڵ و قەوی و لە تەرەححوم دوور
مەءمووری عیقاب ئەزیەت و ئێشن
ناوچاویان ئەگرن ڕایان ئەکێشن
تەسلیمیان ئەکەن بە دەستی مالک
ڕەئیسی تەعزیب تەبەقەی هالک
ئەویشی ئەیان‌دا بە دەست مەءموورۆ
بە قەهر و بۆیان نەچن لە دوورۆ
ئەیان خەنە ناو قەعری جەهەننەم
حەبس‌خانەی پڕ لە ئێش و ئەلەم

که تـێـیـان ئـەخـەن دەسـتە بـە دەسـتە
نـــەعـــرەتـــەپێـــکۆ، ئـــەکـــا بلێســـتە
ئـاگر لـە داخـی ئـەشـقیای بـێ فـەیـز
تَكَـــادُ تَمَيَّـــزُ مِـــنَ الْغَـــيْظِ[١]
مــەءمــووری دۆزەخ جــەســوور و قــایم
عــەزابیــان لـەسـەر زیــاد ئـەکـەن دایــم
ئــەوانــیش هـــەمـــوو(کریــه المنظــر)
بـــێڕەحـــم و بـــەســـام نیهایـــەت بـــەدەر
وایـــان وەســـف ئـــەکـــا(خـــالق العبـــاد)
(ملائکـــــــة غـــــــلاظ شـــــــداد)
حالّـــی ئـــەمانـــە ئـــەبـــەد وەهایـــە
ئـــەبـــەدیـــش مـــەعنـــای (بـــلا نهایـــە)
مــەســەلــەن بــەینـی زەوی و ئاســمان
پڕکـەی لـە هـەرزەن یـا لـە داڕووجـان
تـەیرێـکیش بـێ هـەر بـە هـەزار سـاڵ
یـەک دەنکـی بخـوا بـە فـەرزی مـەحـاڵ
عاقیبـــەت هـــەمـــوو ئـــەبڕێـــتەوە
ئـــەبـــەد هـــەر وەک خـــۆی ئـــەمێنێـــتەوە

---

[١] - الملك/٨

جــا بــە قــەد قســەی منالــێ تــەنیــا
بائــەڕت نیــە بــەو گشــت ئــەنبیــا
دەبــا دەســت بــەردار لــە خراپــە بــی
نــەبــا دووچــاری ئــەو عــەزابــە بــی

## شەرحی نەخۆشی:نەخۆشی دووهەم

بــۆ ئــەوەش ئــەڵــێ مــن خــاوەن بــڕوام
عــەقیــدەم هــەیــە بــە هــەمــوو ئــەحکــام
ئــەممــا عــەلاقــەم بــە تاعــەت کــەمــە
پــەیــوەنــدم لــە گــەڵ دنیــا مــەحکــەمــە
پــــەرداخــــی میســــاڵ حــــازر کــــراوە
شــــەربــــەتــــی شــــیفای بــــۆ تێــــکراوە
بــــەڵام واچاکــــە پێــــش ئــــەوە کــــەوا
پارێــــز بکــــات و دەواکــــەی بخــــوا
ئــــەبــــێ بــــزانێ ئــــەو نــــەخۆشــــییە
کــە ئــەو هــەیــەتــی خــەتــەری چییــە
ئــــەوانــــە کــــە وا بــــەیانمــــان کــــردن
بــۆ میســاڵ نــاوی هــەندێــکمان بــردن
هــەر یــەکێ ڕاوچــی عیشــقی کــەسێــکە
داوی عــــەلاقــــەی قــــاچ و دەسێــــکە

وتمــان لــە هــەرچــێ زەرفــێ پــڕ بکــرێ
مـــەحاڵـــە ئیتـــر شـــتیتـــر بگـــرێ
خـــۆ واجبیشـــە لـــەو وەختـــەدا گیـــان
دەرئـــەچـــێ دڵـــمان پـــڕبێ لـــە ئیمـــان
ڕەزا بـــە قـــەزای خـــودای بێـــچوون بـــین
نەک لە غەمی ژیین لە دەس دەرچـوو بـین
گـەر دڵ لـەو وەختـا لـە ڕۆح جیائـەبێـتۆ
لـــە خـــواوە بـــۆ لای دنیـــا لاکـــاتۆ
(اعاذنـــاالله)ســـەر بـــەرەو خـــوارە
نزیـک لـە تـەردی خـودای جـەبـارە
بـــەڵام ئـــەوانـــە کـــە بـــەختیـــارن
بـــۆ ئیتاعـــەی حـــەق فـــەرمـــان بـــەردارن
لـــێیـــان مـــەعلوومـــە لیـــرە میـــوانن
حـــەقـــی میـــوانی زەریـــف ئـــەزانـــن
ئـــەزانـــن ئـــەگـــەر هـــەرکـــەســـێ تـــاوێ
لـــە جـــێیـــە بـــوو بـــە میـــوانی پیـــاوێ
مالـــی خانـــەخـــوێ بـــا تـــەواو خـــۆش بـــێ
پوخت و ڕازاوە و پڕ عـەیـش و نـۆش بـێ
چـۆن لێـی یـەقینـە هـەرچـەنـد دانیشـێ
بـۆ ڕۆیـین ئـەبـی زەحمـەت بکێشـێ

ئیتر عەلاقەی لەگەڵ ئەو ماڵە
بەلاوە شێتی و فکری بەتاڵە
کە ماڵەکەشی بۆ بەجێ بێڵێ
حەوشەکەی هەموو بە شوکر ئەکێڵێ
چاک ئەم دەرسەیان ڕەوان کردوە
نمرەی نەجاحیان تەواو بردوە
باش ئەدوورن لە بەر گڵۆپی بڕوا
بە دەرزیی عەمەڵ لیباسی تەقوا
وەفقی دەستووری خودای(ذوالمنن)
تەقالا ئەدەن بە ڕۆح و بەدەن
کەسبی موحیببەت خودایان ئەکەن
تا بە سەربەرزی بچنەوە وەتەن
ئەوانە بێ شک هەمیشە دڵیان
کەیلە لە حوببی مەعبوودی خۆیان
لە(وَلَوْ تَرَى إِذِ الْمُجْرِمُون
نَاكِسُو رُءُوسِهِمْ) بەدەر بون
موجریم مەعلوومە سەردانەواوە
وا لە ژێر باری قورسی خەتاوە
دڵ وەکوو زەرفە تا ڕووی لە خوا بێ
پڕە و نارژێ و سەرەوژێر نابێ

دنیـا چـوون دەنـی و فـانی و بـێ خێـرە
دڵـێ ڕووی لـەو بـێ سـەر بـەرەوژێـرە
بۆیـە وا مـوجریم بـە نـەسسـی کتـاب
سـەردانـەواوە لـە ڕۆژی حسـاب
موجریمـە[١] ئـەوە کـاتی ڕۆح دەرچـوون
دڵ موبتـەلابـێ بـە غـەیـری بێـچوون
کـەوابـوو هـەر کـەس بـە چ شتێـکەوە
پـەیـوەنـدی بـبێ و بـژین پێـکەوە
خـەویـش ببینـێ لـەگـەڵ ئـەوایـە
حـەدیسـە مـردن بـۆ خـەو برایـە
گەر خـوا نـەخواسـتە هـەرکـەسێ وابـێ
مـەحـەببـەتـی هـەر لـەگـەڵ دونیا بـێ
ئیرتبـات لـەگـەڵ خـودای خـۆی ببـڕێ
بـە کـوللی پـەردەی مـەعسییەت بـدڕێ
زەحمـەتـە کـاتێ ڕۆح تـەسلیم ئـەکـات
گـەوهـەری لالای سـەعـادەت ببـات
بـەڵـکوو بـە دەردی خـواری دووچـارە
کـە ڕووی لـە خـوارە سـەر بـە رەوخـوارە

---

[١] – وادیارە (جورمە) بی باشترە.

ڕاستە فـەرمـوودەی خـوای ذوالمـنن
مـاڵ و مناڵـتان بـۆ ئێـوە فیتنـەن
خـودا بـە حـەققـی عیـززەتـی شـاهیت
بـە خـەزنـەی ڕەحمـی لاموتـەناهیـت
بە ئیسمی ئەعزەم بە ئـەسـمای حوسـنات
بـە سـیفاتی زات پـاکی بـێهـەمتـات
بـە جـاهی سـیڕڕی سـینەی موسـتەفـا
بـە ئـەنـواری دڵ ئـەربـابی سـەفـا
لـە دەمـی نـەزع و دەرچـوونی گیـانم
نـەکوژێـتەوە چـرای ئیمـانم
بـە ئیمـانی پـڕ مـەحـەبـەتـەوە
بـە شـەوقـی وەسڵـی لـەقـای خۆتـەوە
بە لوتف و ڕەحمەت بـە سـەهـل و ئاسـان
جیـا بکـەیتـەوە لـە بـەدەنمـا گیـان
بە مەحزی فەزیلـەت لـە ڕۆژی مـەحشـەر
حیفزم کە لە گشـت هـەوڵ و وەیـل و شـەڕ
بمخـەرە ئـەهلـی سـەعـادەت
وهـب لـی الحسـنی معالزیـادة

## دەرمانی نەخۆشی– نەخۆشی دووهەم

وا زەریــف زانیــت ئابــەم بــەیانــە
دەردت چ خــەتــەر چــەنــدە گرانــە
لــە پیالــەی تــەمسـیل ئینجـا دەرمانـت
نۆشــی عیبــرەت کــە بــۆ شــفای گیانــت
پیاوێــکی زانــا عــاقڵ و ئــەدیــب
نەخۆش کەوت هەڵسا چوو بـۆلای تـەبیـب
پــاش موعاینــە و تــەشخیســی دەردی
ڕووتــی کــرد دوکتــور پێــی‌وت بــە وردی
ئــەگــەر سیحەتــت ئــەوێ تــا دوو ســاڵ
ئــەبــێ نــەگــەڕێــی دانیشــی لــە مــاڵ
ئــاوی ســارد نــابێ لــە دەمــت کــەوێ
ئــەم مــوددە ئــەگــەر نــەجاتــت ئــەوێ
ڕۆژێ ســێ دەفعــەش ئــەم ئــاوە تاڵــە
ئــەبــێ بخۆیتــۆ تــا ئــەم دوو ساڵــە
زەحمــەتــە ئــەگــەر بــاوەڕ کــا قوســور
بکــا ئــەو مــوددە لــە عــەینــی دەســتور
بــێ شــک بۆئــەوە دە ساڵــێ نــەمــرێ
دوو ســاڵ بــو ســیحەت پارێــز ڕائــەگــرێ

ئـەی تـۆ نـازانی چـی ئـەڵـێ قووڕئـان
دەرحـەق بـە ئـەهلـی قوسـور و عیسـیان
چـەنـد دارای ئێـش و ئـەلـەم و دەردن
ئـەبـەد بـەو نـەوعـە هـەناسـە سـەردن
خـۆ تـێگـەیشـتی کـە ئـەبـەد کامـە
کـە چـەنـد بـە تـوول و ساحێـب دەوامـە
یـا ئـەهلـی تـەقـوا ئـەوانـیش گشـتی
خۆش‌نۆش و دڵخۆش دایـم بـەهـەشـتی
نـە بـەلا نـەتـرس نـە دەرد و میحنـەت
نە غەمی دەرچوون هەرگیـز لـە جـەننـەت
نـە قـەزای حاجـەت نـە چڵـم و بـەڵـغەم
نـە بـێ‌تاقـەتـی نـە پیـری نـە غـەم
ئـەنـواعی میـوە ئـەتعـەمـە و نیعمـەت
هـەر کـات بتـەوێـت حـازر بـێ‌زەحمـەت
هـەرسـەوزەبـاغێ سـازە مـەنـاخی
خۆشـە مـەنـزەرەی کۆشـک و ئـەوتـاغی[1]
لـە گـەڵ عـەیـالا بـە عـەیـش و سـروور
ئـەنۆشـن بـادەی شـراباً طهـور

---

[1] – اوتاغ: حوجره.

بـــەعـــزێ قوســـوری لـــە زیـــو و لـــە زەر
بـــەعـــزێ لـــە دوڕڕ و لـــؤلـــؤ و گـــەوهـــەر
فـــەڕشـــی حـــەریـــر و ئـــەترافـــی گوڵـــزار
جنـــــات تجـــــری تحتهاالانهـــــار
خاکیشـــی هـــەمـــوو میســـک و عـــەبیـــرە
ســـەنعـــەتـــی خـــودای گـــەورە و قـــەدیـــرە
هـــەمـــوو خۆشـــحاڵ و دەم بـــە پێـــکەنـــین
علـــــی سُـــــررٍ مُتقـــــابلین
ئـــەســـنافی لیبـــاس تـــازە و فـــاخرە
ژنـــانی لـــەتیـــف جـــوان و بـــاکرە
تـــەعریفیـــان لـــەمـــە چـــاکتر نـــابینی
کامثـــــال اللؤلـــــؤ المکنـــــونِ
فەزا خـــۆش نـــەســـیم لـــە عـــەتـــر و بۆیـــان
هـــەمـــوو عاشـــقن بـــە مێـــردی خۆیـــان
خۆشـــتر لـــە هـــەمـــوو لـــەززاتـــی نـــەعـــیم
ســـلام قـــولا مـــن رب الـــرحیم
عـــەبدووڵـــڵا کـــوڕی ئیمـــامی عـــەبـــاس
عـــالمی ئـــەســـحاب عـــالی و خودانـــاس
فەرموویـــە بـــەهـــەشـــت جـــێیـــەکـــی وایـــە
تـــەجـــەممـــولاتی لـــە تـــەعریـــف نایـــە

ئـــەوەی کـــە قوورئـــان نـــاوی بـــردوە
نیعمــەتــی یــەک یــەک بــەیــان کــردوە
وەک تــرێ و هــەنــار هــەرچــیتــر هــەیــە
غــەرەز بــۆ فــەهمــی عــەقڵــی ئێــمەیــە
وەرنــە ئــەوانــەی مێــوەی جــەننــەتــن
لــە گــەڵ هــی دنیــا زۆر بــێنســبەتــن
ئــەساســیاتی هـــەمــوو موکــەممــەل
بــاغ و چــەمــاو و قــەســری موجــەللەل
چــــەم و چــــەن و چیــــای دڵــــگیرە
جۆی لــە شــەهــد و ئــاو شــەراب و شــیرە
خــالس لــە ڕەحمــەت دروســت کــراون
بــۆ زومــرەی ئــەحبــاب تــەرتیــب دراون
کــافر چــون دوژمــن خــودای ئــەقــدەســە
لەو جێ کەلــەبچــەی یــەءســی لــە دەســە
بــەڵام چــون دنیــا فــەنــا مــەئالــە
جێــگەی دەرد و غــەم بــەڵاو مــەلالــە
لای خــودا ئــەونــە بــێئــەهــەمییــەتــە
کــافری تێــدا خــاوەن ســەروەتــە
هــەر وایــە چونکــە قــەوڵــی ڕەســوولە
ئــەگــەر بــە قــەد یــەک باڵــە مێشــوولە

قــــەدری ببوایـــــە دنیـــــا لای خـــــودا
بـــە کـــافر قـــومێ ئـــاوی نـــەئـــەدا
ئەممـا چـون بـەهـەشـت عـالی مـەقامـە
بـــەو خۆشیشـــەوە ساحێـــب دەوامـــە
یـــەعنـــی قـــودرەت و عیلمـــی ئیلاهـــی
کـــە نامـــەحـــدوودە و لاموتـــەنـــاهی
بـــە شـــیرین‌تـــرین شێـــوە لـــە ڕەحمـــەت
هێـــنایە وجـــوود ئـــەساســـی جـــەننـــەت
مەعلووم هـەر جێـگەی دۆسـتی خۆیـەتـی
کـــافر لـــە دۆزەخ ڕۆڵـــەڕۆیـــەتـــی
جـــا کـــە تـــۆ بـــڕوات هـــەیـــە بـــەمانـــە
تـــەفـــەککـــور لـــەمـــە یـــەکـــەم دەرمانـــە
پارێـــزی دوو ســـاڵ بـــۆ دە ســـاڵ حـــەیـــات
زۆرە یـــا دە ســـاڵ بـــۆ ئـــەبـــەد لـــەلات
یـــا خۆشـــی دە ســـاڵ عـــومرت مـــەنـــزوورە
یـــا ئـــەبـــەد ئـــەو گشـــت بـــاغ و قوســـوورە
ئێشـــی نـــەخۆشـــیت لـــە لا زیـــاترە
یـــا چـــوونی نـــاو ئـــەو گـــڕ و ئـــاگرە
بـــڕوا و بـــێ‌بـــاکی ئـــا بـــەم دەســـتوورە
کـــەی لـــە ڕەوشـــتی ئـــەهلـــی شـــوعوورە

## تەمسیلی تەسخیری عەقڵ بۆ نەفس

دوو عالەم هەیە هەردووکی حەقە
عالەمی ئەمر و عالەمی خەلقە
عالەمی خەلق بە تەدریجی یە
عالەمی ئەمر فەوری و فوجئی یە
عالەمی خەلق وەک ئەعزای منداڵ
کە تەکمیل ئەبێ بە یەک نیوە ساڵ
عالەمی ئەمر وەک ڕۆح کوتوپڕ
ئەچێ بە بەریا کچ بێ یاکو کوڕ
ڕۆح لە لەتیفەی عالەمی ئەمرە
دوو مەعنا لەم و عەقڵ و دڵ بگرە
مەحاڵە بۆ غەیر ئەربابی فتوح
مونکەشف بێ حەقیقەتی ڕۆح
موجەڕڕەدێکە عائید بە خوایە
موساحە و تەقدیر بە سەریا نایە
ئەمما مەنبەعی رۆحی حەیوانی
وا لە نێو تۆتۆی قەلبی جیسمانی
ئەم بوخارێکە بێغایەت لەتیف
گەیاندبێتی گەرمی دڵ زەریف

بــــە هــــۆی لێــــدانی ڕەگــــەکانــــەوە
بــــۆ بــــەدەن دێــــتە جــــەرەیانــــەوە
فــەیزانــی نــووری حــەواس و حــەیــات
وەک ژووری ڕوونــە لــە شــوعلەی چــرات
ڕۆح بــەم دوو مــەعنــا گــەلێــکیان فــەرقــە
چــون ئــەم لــە ڕیــزی عالــەمــی خــەلقــە
مــەقســوودی دوکتــور لــە ڕۆح ئــەمــەیــە
ئــەمــیش خــارجی باســی ئێــمەیــە
ئــەمــر لــەتیفــە و لای خــودا شــەریــف
وەلــیکن خــەلــق پــەس‌تــرە و کــەســیف
خــوا نسبــەتــی خــەلــق وەلای خــاک ئــەدا
وەلــێ ئــەمــر لای زاتــی پــاک ئــەدا
بۆ جسم ئەفەرمــوی خــەلقــم کــرد لــە گــڵ
(نفخــت فیــە مــن روحــی)بــۆ دڵ
جــا کــەســێ عــەقــڵ بدرێــتە دەســتی
تــا تــەکمیلــی کــا بــە خــوا پــەرەســتی
کــەچــی ئــەو ئــەمــرە کــەریمــە تــەسلیم
بکــا بــە نــەفســی ئــەممــارەی لــەئــیم
ئــەویــش بــە کــردەی زۆر نــامولایم
بیهێنێــتە خــول وەک غــولّام دایــم

مەعلووم ئەحواڵـی شـەخسـی وا سـبەی
لـەم میساڵـەوە زەریـف تـێئـەگـەی
پادشـایەکـی مـەهیـب و جـەسـوور
بـە سـام و بـە دەس قـەدیـر و غـەیـوور
هەر کوورێکی بوو زۆری خـۆش ئـەویسـت
جـاه و جـەلالـی بـێئـەو نـەدەویسـت
لـە بـۆ تـەحسـیلی عـیلم و سیاسـەت
بـۆ وەرگرتنـی عـەقڵـی ڕیاسـەت
بـۆ تـەعلیمـاتی دەسـتوور و ئـاداب
موعـەللمێـکی بـۆکرد ئینتخـاب
زۆر بـە ئـەمانـەت کـوڕەی دا دەسـتی
تـا تـەربیـەی کـا وەفقـی پێویسـتی
خـەڵاتـی کـرد و وەعـدەشـی دایـە
هەر وەخت ئەم کـوڕەی گـەیانـد بـە پایـە
جـائیزەی بـاتێ و لـە گـەڵ ئـەوەشـا
بیکـا بـە یـەکـێ لـە هاوسـەری شـا
شازادەی وەرگرت مـەسـروور و خۆشـحاڵ
پێـکەوە هـەردوو چونـەوە بـۆ مـاڵ
ئـەو مانگانـەش لـە تـەرەف شـاوە
مـەبلـەغـی زۆریـان لـە بـۆ بـڕاوە

موعەللیم لە گەڵ کوورەی بردەوە
بیری دوارۆژی هیچ نەکردەوە
ئەم کوورە هەشت نۆ دەساڵەی هێنا
باری زیللەت و بێگاری لێ نا
لە باتی هەموو تەربیە و تەعلیم
شەو و ڕۆژی بۆ دانا بە تەقسیم
دەفعەیە ئەی نارد بۆ ئیشی بازار
جاری تر بۆ کەژ لە بۆ کۆڵەدار
ساتێ ناو ماڵ و حەوشی ئەماڵی
دەمێ لەلە بوو لە بۆ مناڵی
خولاسە هەتا موددەتی دە ساڵ
ئەم کوڕەی ڕاگرت لە سەر عەینی حاڵ
لە پاش ئەم موددە کە حەق وەهایە
کوور تەخەڕوج کا و بگا بە پایە
شا بە هیواوە چوو بۆ سەردانی
لە گەڵ وزەرا و گەلی ئەعیانی
وەختی شەهریار گەیشتە جێگا
گوڵلەی ئەمەلی سەیدی نەپێکا
وەلی عەهدی دی و نەختێ بۆی ڕوانی
جەمیعی حاڵ و ئەوزاعی زانی

جا ئەبێ قەهری ئەم پادشایە
چۆن بێ لە دەرحەق ئەو بێوەفایە
خۆم بەم میساڵە چاکم حاڵییە
لە گوڵی وەفا باغم خالییە
ئیتر سا منی لە چاکە بەری
کە کردەم دوایی نایە زەرەری
باوەڕم وایە تۆ موقتەدیری
بە مەغفرەت و بە چارە سەری
عیلاجم لە چەنگ نەفس و لە گوناه
عەفووم بفەرموو یا من هوالله
لە سەر ئەسبابی ڕەزات بە دەوام
تۆفیقم بدە یا رب الانام
لە ساحەی ڕەحمەت قەت دەرم مەکە
مەهتووکی دنیا و مەحشەرم مەکە
مەءیوسم لە خۆو لە کردەوەی خۆم
تەنها بە هیوای عەفو و لوتفی تۆم

## بەشەر نوستوە مرد بەخەبەر دێ

ایحب احدکم ان یأکل لحم أخیه میتا فکرهتموه

تــــۆ وابزانــــە لــــە زەمــــانی زوو
سولــتانێ کــوورێ تاقانــەی هــەبــوو
کوورێــکی نــەجیــب جـوان و بـا جـەمـاڵ
فامییــە و زەریــف تــەمــەن هــەژدە ســاڵ
واڕێــکەوت جـارێ ڕۆیشــت بـۆ ســەفـەر
دی‌بــووی لــە(ڕۆمــا)کچێــکی قــەیســەر
لــە گــەڵ بینینــی بــە یــەکــەم نــەزەر
عەشقی ئەو کچـەی بـێ‌حـەد چـووە سـەر
هاتــەوە وەختــی زۆر بــە ســەر نــەبــرد
حالــی خـۆی لـە بـۆ بـاوکی بـەیـان کـرد
قەیسەریـش پرســی کــرد بـە کچـەکـەی
ئەگەر بـەو کـووڕەت بـدەم حـەزئـەکـەی
جــوابی دایــەوە کــە پێــی ڕەزایــە
ئـەمجـارە ئـەویـش کچـەکـەی دایـە
وەخــتێ کــە ئیشــی گشــت بڕایــەوە
بــاوکی کچــەکــەی بــۆ گوێــزایەوە
کــوڕەکــە شــەوێ شــەرابــی نۆشــی
قەسدی کرد بۆ لای کـچ بـە سـەرخۆشـی

تــا بـــەیـــنێ ڕۆیـــی دی ڕووناکییـــە
ڕووی تـــێکـــرد گوایـــا هـــۆدەی بووکییـــە
چـــووە ژوورەوە و ســەیــری کــرد یــەکێــک
لێــی ڕاکشـــاوە لــە ســەر دۆشــەکێــک
کوڕیش بە خەیاڵ مەســتی و ســەرخۆشــی
دەســتی لــە مــل کــرد بــە خۆیــو گۆشــی
دەمـــی لـــە دەم نـــا لێـــوی هـــەڵـــمژی
تونـد دەســتی ئاڵانــد بــە زوڵــف و قــژی
بــەم فکــرە کــە ئــەم عــارەق و ئــاوە
وا بــە ڕووی بــووک و عــەتــر و گــوڵاوە
تــا تلــوعی کــرد هــەر بــەو خــەیاڵــە
ئــەو کــووڕە مــاوە لــە ســەر ئــەو حاڵــە
کـــە تلـــووعی کـــرد هۆشـــی هاتـــەوە
خــوا لــە هــیچ کــەس وا ڕۆژ نــەکاتــەوە
بینــی کــە ئــەم جــێ و ئائــەم عروســە
مردوی کە نــەشــتەی خــەیلێ مــەجوســە
خــۆی دی ســەراپــای گشــت هــەڵکشــاوە
لـــە خوێـــن و زوخ و لیـــک و ڕشـــاوە
ئــەو هــەڵــمژینە کــە پێــی گــوڵاو بــوو
گشـــت ڕشـــانەوەو لیـــک و زوخـــاو بـــوو

دە بــێ لــە قیــزا مــەمــرە لــە تــاوا
کــە خــۆت ببینــی لــە حاڵــی ئــاوا
دیســان لــە عــەینی ئــەم حاڵــە پــەرتــا
شاو دەستەی ئەعیان گشت بێن بە سەرتا
لــە دنیــاش هــەرچــی لــە شــەهــەواتــە
حــەرام بــێ و بیکــەی وەک ئــەوە واتــە
غەیبەتت کردووە یــا گوێــت گرتــووە بــۆی
کــە مــردی گۆشــتی مــردووە ئــەیخــۆی
مــەگــەر بــە تۆبــە نــەجــات بــێ لــە دەس
شومی بەد خوویی و جەزای کردەی نەفس
یاربنــــا البــــر احســــن الینــــا
وامــــح ذنبنــــا وتــــب علینــــا
وفــــرج عنــــا الکــــرب والزحمــــه
واتنــــا مــــن لــــدنک رحمــــه

## کە مردی حاڵی ئەبی خوا چاوی لە هەموو کردەوەیەکتەوە بووە بە یەقین

پادشــــایەکــــی عــــالی و زۆر بــــە دەس
تەقــەڕوبــیدا بــە شــەخســێ بــێکــەس
وەهایە سەرسەخت لــە ڕوتبــەی پــەستی
ئومــــووری ماڵــــی خســــتە ژێــــر دەســــتی

بێ ئیجازە و مەنع هەروەکوو مەحرەم
ئەچوو بۆ ئەرک و ئەهاتۆ حەرەم
موددەیەکی زۆر هەر وەها ماوە
تەقدیر وەرەقی لێ هەڵگێڕاوە
نەفسی تەفرەی دا لە بۆ غەش کردن
بۆ ماڵی سوڵتان بە تاڵان بردن
بێ قوسوور دەستی دایە خەیانەت
شکانی قوفڵی قاپی ئەمانەت
دەستی کرد بە غەش لە حەرەم سەرا
لە گەڵ جاری یە و هەم کارەکەرا
بەینێ مایەوە لە سەر ئەم ئیشە
ڕۆژێ لە عەین الفصلی ئەم ئیشە
سەری هەڵبڕی سەیری کرد ناگا
شا لە کونێکۆ تەماشای ئەکا
لێشی مەعلووم بوو بۆیە تا ئیسە
بێ دەنگ بووە لەم کردەوە پیسە
تا قەهری باشتر گڵپە بسێنێ
ناپاکی ئاوای پێ هەڵکزێنێ
ئاخر نەفەس هات هەموو بێ دینێ
لە خزمەت خوادا خۆی خۆی ئەبینێ

یارەببی خالس بە مەحزی ڕەحمەت
حیفزم کە لە گشت خواری و فەزیحەت

## میسالی سوتاندنی رۆحانی بە ئاگری جیابونەوە لە موتەعەللقاتی و محبوبانی

مەسەلەن کەسێ ئیمپراتور بێ
خاوەن بارەگا و قەسر و قوسور بێ
ئەمینی لە ئاشوب بێدەرد و ئەلەم
بێ ترسی عەزل و بێحەسرەت و غەم
زۆر بە عەیاشی لە گەڵ عەیالا
ڕابوێری لە گەڵ ماڵ و منالا
غەفلەتەن لە پڕ لە هەموو لاوە
ئەونە بزانێ دەورەیان داوە
فریا نەکەوێ خۆی کۆکاتەوە
لە پڕ قائیدێ قاپی کاتەوە
پەلی ببەستی بیهێنیتە دەر
بە زیللەت بەرەو جەیش بیداتە بەر
مەسەنەدی شاهی و کەنیزەکانی
قەسر و بارەگاو ئەرک و ئەیوانی
هەمووی بە جارێ ئیستیلا بکرێ
ببرێتە ڕیزێ کەس قەدری نەگرێ

لە گەڵ ئەوەشا بیکەن بە بەردەس
شەخسێ بێشەئنی بێڕەحمی ناکەس
لە بەرچاویشی (منصِب)ی شاهی
تاجی کەیانی و دەوڵەت و جاهی
بە جارێ هەمووی تەسەڕڕوف بکرێ
دەستی تەعەددا بۆ هەمووی ببرێ
ئەبێ حەسرەت و داخی چەندە بێ
دوێ شەهریار و ئەمڕو بەندە بێ
کەمێکیش کەوا دڵی بە تەنیا
ماڵامال بکا لە حوببی دنیا
وەختێ مرد حاڵی وەک ئەوە وایە
دوێ شابوو ئیمڕۆ وا بێنەوایە
ژن و ماڵیشی تەسەڕڕوف بکرێ
هەر پرزۆڵێکی بۆ لایە ئەبرێ
ئەمما ئەو کەسە دۆستی خودایە
ئازار لە غەمی هەر دوو دنیایە
خودا بە حەققی اعظم الأسمات
بە ئەسمای حوسنا و بە سفاتی زات
بە حەقیقەتی ئەو مەحەبەتە
کە لە گەڵ خیر البشردا هەتە

بە سەنای قوربی ئەو سەنا و حەمدە
لە حەشرا ئەیڵێ لە کاتی سەجدە
بە گەرمی و سۆزی ئەو موناجاتە
کە لەبۆ بەرزی و عەفو و نەجاتە
بە ئیستجابەی ئەو شەفاعەتە
کە بەهای فەوزی بێبیزاعەتە
مەپرسە لەوە زۆرە یا کەمە
خۆشبە لە هەرچی گوناهێ هەمە
لە ژین و کاتی مردن و مەئال
پارێزگاریم کە لە دەرد و مەلال
حوببی داریـنم لە دڵا دەرکە
بە شەوقی لیقات دڵ مونەووەرکە
بە سەعادەتی تامەی هەر دوولا
نائیلم بکە یا نعم المولی
مەخسوس بە فەزیلەت لە نەشئەی ئەولام
فردەوسی بەرین بکە بە مەءوام
پاڕانەوەم گشت لێ قەبووڵ فەرموو
بە کەرەمی خۆت یا من هو هو

## بەیانی بێ کەڵکی پەشیمانی

تاقمێ هەڵسان ڕۆشتن بۆ سەفەر
چەند چۆڵ و سەخت و کەژیان گرتە بەر
شەوێکی هەور و زۆر تاریک و توون
ڕێیان هەڵە کرد بە غارێکا چوون
بە کوێری ڕۆیین شەو تا بەیانی
هەموش ڕێگەیان بە دەشت ئەزانی
هیچ کەسیان فکریان بۆ ئەمە نەچوو
کە ئەوە ئەمان پیاهاتن کون بوو
پاش موددەیە زۆر حاڵی بوو لێیان
کە ئەمە کونە و مژ پەنی پێدان
دیسان تا مەغریب بە تەمای نەجات
ڕۆیین و کون هەر دووایی نەهات
پاش تەحقیق دەرکەوت وەک توولی وایە
پانیشی هەروا بێ ئینتهایە
هەندێ لەوانە جەواهیرناس بوون
سەڕڕافی گەوهەر لەعل و ئەڵماس بوون
ئەوانە دەستیان ئەگیرا لە خاک
بەردیان هەڵئەگرت ئەیان خستە چاک

لێیان مەعلووم بوو بە فەننی خۆیان
بەردی قیمەتی ڕژاوە بۆیان
کۆیان کردەوە لەو وردە بەردە
لیباسی بەریان بۆ کرد بە فەردە
باقی بە قاقای پێکەنینەوە
بە دەست بەتاڵی و هەڵپەڕینەوە
بە ئیستهزاوە ڕێیان گرتە بەر
ئەیان وت های دوڕڕ های لەعل و گەوهەر
ئەوانیش قەتعەن بەو ئیستهزایە
سەخڵەت نەبوون و گوێیان نەدایە
موختەسەر هاتن ڕوویان پێوەنا
تا لە کونێکۆ سەریان دەرهێنا
هاتنە دەرەوە لە ناوقەدی شاخ
شاخێ هەڵەت و سەخت و سەنگلاخ
بە سەد ترس و لەرز ئەم بەرد و ئەو بەرد
هەتا خەلاس بوون لە چنگ شاخ و هەرد
وەختێ هاتنەوە گەیشتنە جێگا
لە بیریان چووە زەحمەتی ڕێگا
کۆڵیان کردەوە دەستەی جەوهەرناس
هەموو گەوهەر بوو یاقوت و ئەڵماس

هــەریــەکــێ بــۆ خــۆی بــە عــەینــی مایــە
بــوو بــە سولــّـتان و گــەیشــت بــە پایــە
ئــەوانــی‌تــریش بــە گــڕی حــەســرەت
ئاگریــان تــێ‌چــوو ســوتان یــەک کــەرەت
تــــاریکی دنیــــاش کــــە بڕایــــەوە
(اشــرقت الارض) شــــەوقــــی دایــــەوە
ئــەمانــەی ئیمــڕۆ ئیســـتهزا ئــەکــەن
بــە تاعــەت سـبەی بــەو سـزا ئــەگــەن
یا ڕەبــب بــەحــەققــی فــەزلــی عــەزیمــت
بــە دەریــای جــوود و لــوتفی عــەمیمــت
بــە نــەسـیمی حــوب سـوبحی ئــەم دینــە
بۆخەنــدەی شــەرحــی گولــّغونچەی سـینە
بولــّبولــّـی دلــّــەی لــە نــەوا خــەمــۆش
بە نــەشــئەی بــاخێ بــەختــی بێنــە جۆش



## شیی کردنەوەی دنیا و مەئالی

عومری تەبیعی شەست و سێ سالە
تا پانزەی مەعلووم ئینسان منالە
بینست و چواریشی لە باقی شەوە
عالەمی غەفلەت بێهۆشی و خەوە
دوازدەشی ئێش و دەرد و نەخۆشی
بێتاقەتییە و غەم و پەرۆشی
باقیشی کە وا پاکە لە مانە
تێکەڵی لێڵی فکری ژیانە
ئانێکیش ئەمین نیە کە نەمرێ
یا دەردی مردن کتوپڕ نەگرێ
دنیایە ئەونە پڕ لە جەفا بێ
یارێکی وا بێ میهر و وەفا بێ
هەر کەسێ ئاشنا بەو جۆرە بگرێ
نیسبەتی عقڵی حەیفە لێبدرێ
ئەگەر ئەو شەستەش ببێ بە سەد ساڵ
بێ کار و بێغەم مەسرور و خۆشحاڵ
مادام کە تاڵی فەنای لە پاشە
عاقڵ هەر ئەڵێ بێڕەبتی باشە

تـــامی ئـــەو قســـە زۆر خۆشـــە لـــە لام
ئـــەم دونیـــا خـــەوە و عـــەیشـــی ئیحـــتلام
زانـــا کـــە وەخـــتێ جیهـــانی ناســـی
دەس لـــە عـــەلاقـــەی بـــڕی بـــە ڕاســـی
چـــون زانیـــی کـــە جێـــی موســـافرەتـــە
بـــۆ وەتـــەن موحتـــاج بـــە تیجـــارەتـــە
عومریش ســـەرمایـــەی هـــەر نـــەفـــەرێـکە
نەفەسیش هـــەریـــەک وەک گـــەوهـــەرێـکە
گـــەر قـــازانج بکـــا ئـــەم تیجـــارەتـــە
عـــەیشێـــکی یـــەکجـــار بـــێنیهایـــەتـــە
وەگـــەر زەرەر کـــا شـــەقـــا و حیرمانـــە
پـــەنـــا بـــە لـــوتفی خـــودا لـــەمیانـــە
چون هـــەر نـــەفـــەسێ کـــە دێـــت و ئـــەڕوا
ئـــەتـــوانین لـــەفـــزێ تـــەواوکـــەیـــن لـــەوا
ئـــەگـــەر زیکـــری بـــێ گـــەوهـــەرێ وایـــە
بـــۆ ســـبەی چـــاکتر لـــە گشـــت دنیایـــە
وەگـــەر ئـــەو نوتقـــە شـــەرعـــەن خرابـــە
پشـــکویەکـــە بـــۆ ســـبەی عـــەزابـــە
گەر مـــوبـــاحیش بـــێ بـــۆ ڕۆژی مـــەحشـــەر
وەک گڵـــمۆتیکە بـــێنـــەفـــع و زەرەر

فەرموویە حەزرەت ئەترافی جەننەت
دەورە دراوە بە جەهد و میحنەت
ئاگریش دیسان دەورە دراوە
بە شەهەوات و مەیل و هەواوە
جاهیلیش دەستی عەقلی کۆتایە
زەننی وەک وەهمی پەپولە وایە
کە وەختێ بە شەو چرا ئەبینێ
بە دەورەدانی خۆی ئەسوتێنێ
مەعلوومە کە ئەو خۆسوتاندنە
سەبەبی وەهمی غەڵەت بردنە
وەها ئەزانێ ئەو هۆدە تەنیا
تاریکە وەرنە هەتاوە دنیا
ئەڵێ ئەو گرە کونی دیوارە
ڕوناکی ڕۆژی لێوە دیارە
مەیلی بە گەشی فەزای هەتاوە
هەر خۆی لێ ئەدا و دێتەوە دواوە
هەموو کەرەتێ ئەڵێ دوبارە
نەمپێکا بەڵکو دەرچم ئەمجارە
ئەم بەسەزمانە هەروا بە عەبەس
خۆی بە دەستی خۆی ئەکا بە قەقنەس

ئینسانیش هەروا شەوقی ئارەزوو
ئەبینێ و پەلاماری ئەدا زوو
کوێرە دەرکی ئەو نەفسە چڵێسە
کە دوایی ئەو گڕە و بڵێسە
بۆیە فەرموویە سیدالانام
علیە الف آلاف السلام
کەمەرم گرتون بۆ ئەوە ئێوە
نەکەونە گڕی پڕبڵێسەوە
کەچی ئێوە هەر پەپوولە ئاسا
هەڵئەوەرنە ناو، ئاگر لە پەسا
زانا ئەمانە تەعەققول ئەکات
تا لە پڕ لەلای تەمەسسول ئەکات
بە پیرێژنی فەرتوت و کەوتوو
بێمیهر و سوبات قەبیح و بەدخوو
وەها لە وەزعی ڕقی هەڵئەسێ
فەرمووی تەڵاقی ئەدا سێ بە سێ
دڵ خاڵی ئەکا لە مەحەبەتی
دائەنێ کوڵی غەم و میحنەتی
هەوێی ئاخیرەت کە لێی توڕابوو
لە بەر حوببی ئەم مەیلی گۆڕابوو

ئاشـــت ئـــەبێـــتەوە دێـــتەوە بـــۆلای
ئارایشـــت ئـــەدا ماڵـــێ لـــە مـــەولای
ئـــەمما تـــاقمێ عولـــوی هیممـــەتیـــان
قـــووەی پـــەروازی بـــازی غیـــرەتیـــان
ئـــەگاتـــە جێـــیە ســـەفینـــەی عوقـــول
لە مەوجـی حـەیـرەت دێـتە گێـژ و خـول
دنیـــا و ئـــاخیرەت ئـــەنێـــنە لاوە
ئەچن بە سـەر وەخـت عـەشـقی مـەولاوە
مـەشـهورن لـە نـاو ئـەهلـی ئـەم دنیـا
بـە ئـەهلـی عیرفـان یـا بـە ئـەولیـا

## باسی ئەولیای کیرام

وەلـــی ســـاحبی ڕوتبـــەیـــە وایـــە
شـەهـەنشـای دنیـای لـە لا گـەدایـە
بـۆت مـەعلـووم ئـەبـێ ئابـەم میسـالە
کـە چـەنـد خـاوەنـی جـاه و جـەلالـە
سولـــتانێ جـــارێ بینـــی لـــە جـــێیـە
منالـــێ خـــەریـــک ماڵـــە کـــۆچێیـە
مـەلیـک وتـی بـەو تفلـە سـێسالـە
ئـەگـەر تـۆ بیـدەی بـە مـن ئـەو ماڵـە

منیش لەباتی ئەوە بێمنەت
ئەتدەمێ تاج و تەختی سەڵتەنەت
چوون داعی جاە و ئیستیلای نەبوو
لە ژێر ئەو سەودا بە جیددی دەرچوو
چوون ئەبێ بەشەر سەرف بکا عومرێ
ئەوجا داعیەی جاهی پێئەدرێ
بەزەیی هاتۆ شا بەو منالە
کە دڵ خۆش ئەکا بەو نەختە ماڵە
هەروا گەر وەلیش بڵێ بە شایە
ئەتدەمێ هەرچی لە شەءنمایە
بەو شەرتە کە تۆش تاجی سەڵتەنەت
لە جیاتی ئەوە بە منی بدەیت
مەعلووم مەلەکیش بەو موعاوەزە
وەک عەینی مناڵ توورە و عاجزە
وەلیش شەربەتی حیرەت نۆش کا
کە ئەو شا دڵی بە چی خۆش ئەکا
لەم تەمسیلە تۆ سەرسام مەمێنە
دووکەڵی ئینکار بە دڵ مەیەنە
وەلی کەسێکە دۆستی خودایە
بە دڵ موستەغنی لە ماسیوایە

دایـم تـەسـلیمی قـەبـزەی قـەزایـە
ئەو لە حـەق ڕازی و حـەق لـەو ڕەزایـە
گـەرچـی بـە جـەسـەد لـە نـا سـوتایە
بـە ڕۆح لـە جـەولـەی مـەلکوتایـە

## سەرەتای باسی ئەولیا

هەرچەند ئەم بـەحسـە حـەققـی مـن نیـە
ئامـە عائیـدی ئـەهلـی مـەعنیـە
نەک مـن هـەر تـەنهـا لـە مـەعنـا دوورم
هـەر تـەواو خـاتی و ئـەهلـی قوسـوورم
بـەڵام ئیمـانم وایـە بـەوانـە
هـەرچـی دەرحـەقیـان وتـراوە وانـە
منـیش هـەرچێـکم بیسـتبێ وە یـا
دیبێـتم بـە خـەت باسـی ئـەولیـا
ئـەی نووسـم لێـرە هـەرچـی بـزانم
کـە موناسـیبە ئـەوەی بتـوانم
شایەد بـە بـەزڵـی نـەقـدی هیممـەتیـان
بـە فـائیز بـوونم بـە بـەرەکـەتیـان
قەڵـەم بـێ بـەسـەر کاففـەی مـەعاسـیم
ڕوونـاک بێـتەوە دڵـەکـەی قاسـیم

بــە هــۆی نیشــانەی داخــی نیســبەتیــان
بــە عــەتــری گوڵــی بــاخی نیســبەتیــان
دڵ خۆش لەوەڕی مــەرتــەعــی هــۆش بــێ
دایــم دەمــاخی بــێئــاخیم خــۆش بــێ
بکــەومــە دوایــان بــەم نــەختــە زادە
بــۆ ســیاحەتــی ســاحەی ســەعــادە
زاهیرەن بــێهــۆش مــەعنــەن خــەبــەردار
صــــدورالأحرار قبــــور الأســــرار
بــەڵام شــا موحتــاج ئــەهلــی دنیایــە
دنیــایش لا وەلــی وەک ئــەمــە وایــە
گــەر شــەهریــارێ وەهــا پــەیــدابێ
ئومور هەر لــە چنــگ شــەخســی خۆیــابێ
کــەسێــکیش تــەنیــا نانێــکی پــێبــێ
شەخسێ بێ هیچ کــەس نــەزانــێ کــێبــێ
بــۆ مــەواجهــەی شــای پــڕ مــەیمــەنــەت
ڕۆیینــی لــەبــۆ قــاپی ســەڵــتەنــەت
لــەوێ ســەگێــکی زەلامــی عــەجــوول
وەســتابێ مــەنعــی بکــا لــە دوخــوول
خێــرا نانــەکــەی بــۆ بخــا و بــەتــاو
لە چنگــی دەرچــێ بــە یــەک دوو هــەنگــاو

بگاتــە حــەوشـــی ئـــەمـــن و ڕەفـــاهی
لەوێش سـەرکـەوێ تـا قـەسـری شـاهی
ئیجـازەی بـدرێ بـێ ڕەنـج و میحنـەت
بۆ تـالاری خـاس ئـەرکـی سـەڵـتەنـەت
لــەوێ کــە نائیــل بــوو بــە مولاقــات
نــەوازش کــرا و (منصِــب)ی بــۆ هــات
زۆری پــێ نــەچوو بــە ئــەمـری سوڵـتان
خــرا ژێــر دەســی ئومــووری جیهــان
جــا قــەت هیممــەتــی لا ئــەکاتــەوە
لــەو لــەتــە نانــە بیــر بکاتــەوە
بلــێ کــە هــاتم نانێــکم پــێ بــوو
چۆن دام بـەو سـەگـە لـە چنگم دەرچـوو
هــەروا لای ئــەوە ئــەهلــی عیرفانــە
دنیــا ســەراســەر یــەک لــەتــە نانــە
شــەیتــانیش ســەگــی قــاپی خودایــە
بــۆ مــەنعــی دوخــوول لــەو دەرکــەدایــە
ڕەحمــەتــە لــە گــەڵ نــانی جیهانــا
ڕێ بــدا ســەرکــەیــن بــەو ئاســتانا
ئەمما ئەوکـەسـە هیممـەت بوڵـەنـد بـوو
دنیــای بــۆ خســت و مــەردانــە دەرچــوو

گەیشتە حەوشی کەوکەبەی شاهی
حەساری هۆش و دەرک و ئاگاهی
گوڵزاری ئەسرار باغی جەبەروت
لە بیری بردۆ زیندانی ناسوت
لەویشۆ لە بۆ مەقامی لاهوت
سەرکەوت بۆ سەراپەردەی مەلەکوت
نائیل بوو بە ئەوج مەسەندی ئەعلا
مەست بوو بە بادەی عەشقی تەجەللا
ڕوخسەتی درا لە سوفل و عولوا
بە تەجریدی ڕۆح لە جەسەد بڕوا
لە خەزنەی ئەسرار شاد بوو بە ئیدراک
جەواهیری ڕۆح ئەنبیا و ئەملاک
بە دنیا بە حەقق بە نانێ بە شا
گەیشتن نیسبەت هەر نییە حاشا

❋❋❋❋

## ئاگاداری

بـــەڵام تـــۆ وەهـــا مـــەزانـــە تـــەنیـــا
بـــە تـــەخلییـــەی دڵ لـــە حـــوببی دنیـــا
دەس بـــدا بـــۆ کـــەس ئـــەو مـــەقاماتـــە
مـــەورد بـــێ بـــۆ ئـــەو گشـــت کـــەڕاماتـــە
بـــەڵام گـــەر جـــامێ پـــڕبێ لـــە چڵـــکاو
بتـــەوێ بیکـــەی بـــە قـــاپی شـــەکـــراو
لـــە پـــاش ڕشـــتن و ششـــتنی نوێـــژی
ئـــەتـــوانی لـــەوا شـــەربـــەت بچێـــژی
تـــا زەرفـــی دڵـــیش تـــەخلییـــە نـــەکـــرێ
لـــە حـــوببی دنیـــا شستوشـــۆ نـــەدرێ
زەحمەت شەربەتـی مـەحـەبـەت بگـرێ
بـــە عـــەتـــری شـــوهود پـــەروەردە بکـــرێ
تـــەحلییـــەی بـــێ بـــە حوســـنی ڕەوشـــت
کلیلـــی خـــەزنـــەی فـــەیـــز بگرێـــتە مشـــت
واســـتەی وســـوول بـــەو شـــەئـــن و پایـــە
کـــەماڵـــی عیشـــقی حـــەق تـــەعالایـــە
خـــۆ بـــێ‌ناســـینیش مـــومکین‌نـــابێ قـــەت
بۆکەس دەس بدا عیشـــق و مـــەحـــەبـــەت

ناسـینیش بـە بـێ‌ئیدامـە بـە بیـر
لـە کـەونـا بـەپێـی تـەعلیمـاتی پیـر
موشکڵـە بگـا کـەس بـەو کـەرەمـە
مەگـەر مـوراد بـێ ئـەویـش زۆر کـەمـە
ئـەویـش تـەربیـەی پیـری هـەر ئـەوێ
بێ پیر مـەتڵـەبـی خـۆی دەس ناکـەوێ

## چاو ڕۆشنی بۆ ڕێگای مەحەبەت

عـادەتـەن بـەشـەر پیـر یـا مناڵـە
دڵـی عاشـقی حوسـن و جـەماڵـە
چون حوسنی ڕوخسار هـەروەک گوڵـی هـەرد
یـا پیـری ئـەیبـا یـا حـەفتـەیـە دەرد
عـاقڵ بـە جـوانی سـیرەت موشـتاقە
پـەروانـەی چـرای حوسـنی ئـەخلاقـە
لـە خـولقی پـیس و خـووی نـامولایم
بـە کـوللی بـەدڵ بێـزارە دایـم
هـەتـا گـەر بڵێـن ڕەئیسـێ لـە شـەرق
خوێن‌ڕێژە و بەخیـل تونـدە و کـەللەشـەق
میللـەتـی دایـم برسـی و ڕەجاڵـن
شـەو و ڕۆژ خـەریـک هـەر دەس‌بـەتاڵـن

تالب بە زوولم و بە ناحەققی‌یە
تالان‌کەری گشت ماڵی خەلقی‌یە
عالەم لە دەسی بێزارە هەموو
بێ‌دینە و دەنی عەبووسە و بەدخوو
چەندە مەحرڕوومە لە کردەی چاکە
نیەتی سەد قات پیس و ناپاکە
وە یا گەر بڵێین مەلیکی ئەفغان
شەخسێکە شەریف عالی و بە ویژدان
هێمنە و حەلیم بە دین و عاقڵ
ڕوو خۆش و بەشوش سەموح و عادڵ
میللەتی خۆشحاڵ لایق و شۆخن
دایم موستەریح گشت تێر و تۆخن
تا تەسەوورکەی عەفیف و پاکە
نییەتی لە گەڵ هەموو کەس چاکە
بێ‌تامەی کەرەم بەم و جەفای ئەو
ئەمت خۆش ئەوێ و قینت ئەبێ لەو
خۆ کەمالاتیش هەرچی مەوجوودە
ڕەشحەیە لە خولق خودای مەعبوودە
چوونی دەروازەی نەزەر لە ئەخلاق
سەبەبی قوربە بە سەففی عوششاق

ئـەوجا بـەو نـەهجا ئـەچـن کـە وتمـان
تــەفــەککــوری وورد لــە وەزعــی یــەزدان
پــاش تــەخلییــەی دڵ لــە حــوببی دنیــا
ئـەیکـەن بـە عـادەت لـە جێـیە تـەنیـا
ئــەخوێــنین دەرســی ڕەساڵــەی ئافــاق
تـەئلیفـی مـونیـف حـەزرەتـی خـەلـلاق
چونکــە مــەوزوعــی ناســینی ئــەوە
مــەشــەڕڕەف ئــەبــن نــەتیجــە بــەوە
هــەروەک عــالمی عــاریف و عــالی
لــە فــەزل و عیلمــا نــەبــێ ئــەمســالی
لــە هــەر فــەننێــکا تــەئلــیفێ لایــق
بکــا پــڕ نوکتــە و مــەعنــا و حــەقــایق
جا هەرکـەس بـە پێـی ئیسـتعدادی خـۆی
موتالعــەیــان گــەر دەس بــدا بــۆی
مـەبلـەغـی عـیلم و غـەریـزەی زەکـای
ئـەو موسـەننیفـە مـەعلـووم ئـەبـێ لای
تــا عــیلمێ لــەلای زیــاتر دەرکــەوێ
باشــتر لـە پێشــتر ئـەوی خـۆش ئـەوێ
موتالـەعـەش لـەم کـەونـەدا کـەم کـەم
بە تەرتیـب کۆگـای عیرفـان ئـەکا جـەم

عیرفـــانیش هـــەتـــا هوجـــوومکاتـــە دڵ
قـــازانی عیشـــقیش چـــاکتر دێـــتە کـــوڵ
خـــودا بـــە حـــەققـــی (خیرالخلیقـــە)
هـــەم بـــە شێـــرانی بێشـــەی تـــەریقـــە
بە بای وەشـتی فـەیـز قیبلـەکـەی قیـدەم
فـــەزا پـــڕ بکـــا فـــەیزانـــی کـــەرەم
نرکەی هەوری جود دەس بە بـەخشین کـا
ڕەهێڵـــەی عیرفـــان زەوی دڵ شـــینکـــا

## سەبەبی وصول رزقنا الله اياه و القبول
## بجاه حضرة الرسول

بـــەڵام بـــۆ وســـوول بـــە ئـــەوجـــی ئـــەعـــلا
شـــەرتـــە (تَخَلُّـــق) بـــە ئـــەخـــلاق الله
چون گەر لـە بـەینـی دووکـەسـا نسـبەت
هـەر نـەبـێ دۆسـتـی مـەحالـە ئـەلـبەت
قـــایمترینـــی ڕشـــتەی عـــەلاقـــە
لـە بـۆ مـەحـەبـبـەت قـوربی ئـەخلاقـە
عـــارفێ جـــارێ ڕێـــی کـــەوتـــە چۆڵـــێ
ڕوانـــی بازێـــک و قـــەلـــێ لـــە دۆڵـــێ
پێـــکو ئـــەوەســـتن پێـــکەوە ئـــەڕۆن
لە گەڵ یەک ئـەنـون دوو بـە دوو ئـەخـۆن

بـــه دەوام بیـــری لـــێ کردنـــەوه
بـــۆچی لـــه یـــەکتـــر جیانابنـــەوه
ئـــاخۆ ئولفـــەتیـــان حیکمـــەتـــی چییـــه
خـــۆ ئیتتحـــادی نـــەوعیـــان نییـــه
کـــه دیققـــەتـــی کـــرد لـــەم بـــاز و قـــەلـــه
بینـــی هـــەریـــەکـــه پـــێیـــەکیـــان شـــەلـــه
وتـــی لـــه بـــەینـــا ئیتتحـــاد ئـــەڵـــبەت
لـــه وەســـفا هۆیـــه لـــه بـــۆ مـــەحـــەببـــەت
لـــه بـــازو ئـــەمجـــا بـــازده بـــۆ ئـــەم لا
قـــــل و لله المثـــــل الأعـــــلا
دەفعەیـــه فـــەرمـــووی ڕەســـوولی ئـــەکـــرەم
سێسەد خولـــق هـــەیـــه بـــۆ خـــودای عالـــەم
لـــه گـــەڵ ئیمانـــا یـــەکـــێ لـــەوانـــه
لـــه هـــەرکـــەســـا بـــێ جێـــگەی جینانـــه
یـــاری غـــار فـــەرمـــووی لـــەوانـــه قوربـــان
لـــه نـــەفســـی منـــدا مـــەوجـــوده هیچیـــان
له جـــوابی ئـــەودا شـــاهی دیـــن فـــەرمـــووی
لـــه نـــەفســـی تـــۆدا مـــەوجـــوده هـــەمـــووی
بۆیـــه وەقـــرەی گـــرت ســـرڕ لـــه سینـــەیدا
شوهوود نـــەقشـــی بـــەســـت لـــه ئایینـــەیدا

بێ سرڕ نەیفەرموو سەییدی وەسیق
گەر بکێشرایە ئیمانی سددیق
لەگەڵ ئیمانی ئەهلی ئەرز هەموو
هەر ئیمانی ئەو ڕاجیح تر ئەبوو
لەئەولیاشدا ئەکمەل ئەوانەن
دارای ئەو سرڕە و ئەو ڕەوشتانەن
بەڵام ئەم ڕێگە ڕێیەکی وایە
پایانی دووری و زەحمەتی نایە
چەن کەژی سەخت و بیابانی چۆڵ
چەن بادیەی کرک تن و شیوو دۆڵ
چەن بەحری بێ پەی لەو بەینەدایە
چەن ڕێی خەتەر و دڵ بە تەنیایە
هەرچەند حەقیقەت ڕێگەی وسولە
ئەمما جێی ترسی دڕندە و غولە
هەر زۆر موشکلە بە تەنها دەرچون
لە ڕێی وا دور و پڕ بەڵا و تون تون
ڕێگەی سەر بڕ و ئاسان و ئەمین
لە گەڵ سەرکردەی قافلەی یەقین
توند دەس گرتنە بەو حەلقە کەوا
سلسلەی حەلقە تا خاتەم ئەڕوا

**بەیانی ئیستیعدادی بەشەر بۆ وصول بە ئیمانی شهودی وە ئیحتیاجی بەشەر بە وەسیلەی جەلبی فیوضاتی ئیلاهی**

هەنگامی ئاهەنگ دەعوەتی ئەسڕا
شەوی حوزور و خلعەتی کوبڕا
لە دەمی زوهوور تەجەللای ئەکبەڕ
تەتویج بە شەئنی (مازاغ البصر)
بە دوچاوی سەر ڕەسوولی ئەکرەم
بینی زاتی پاک خەللاقی عالەم
جەماڵی کەوا ڕۆئیەتی فەرموو
دائیم لە دڵیا موتەجەللا بوو
ئاوێنەی سینەی سددیقی کامیل
چۆن پاک بوو لە گشت گەردی ڕەزائیل
ڕووی تەوەججوهی لە دڵی فەرموو
نائیل بە ڕوتبەی سددیقیەت بوو
بەو لوتفە حەزرەت کردی لەگەڵیا
ئەسرار وەقرەی گرت هەمووی لە دڵیا
لەوێیشۆ هەروا دەستە بە دەستە
تەودیع بە یەکتر کرا تا ئێستە
چۆن ئەگەر داینێی چەند ئاوێنەیەک
هەموو بێ حائل بەرابەر بە یەک

ڕۆژ گـــەر بـــە ئـــەووەڵ تـــەقابـــل بكـــا
ئەو نـــوورە یـــەک یـــەک بـــە گشـــتی ئـــەگـــا
دڵـــیش لـــە ئـــەســـڵا هـــەر وەک ئاوێـــنە
ســـاف و بـــێ‌غـــەش و پـــاک و خاوێـــنە
ئـــەممـــا چـین چینـــی پـــەردەی ڕەزائیـــل
بـــۆ دەرکـــی ئـــەســـرار بـــوون بـــە حائیـــل
ڕەزائیلـــیش چـــون خـــولقی شـــەیتانـــە
نیســـبەتـــی زۆرە بـــەو ڕەوشـــتانە
دائـــیم ئـــەو دڵـــە هێـــلانەی ئـــەوە
مـــەئـــوای کونـــەبـــوی وێـــرانەی ئـــەوە
ماڵێـــکیش دوژمـــن بیکـــا بـــە مـــەئـــوا
ڕەحمـــەتـــە ئیتـــر دۆســـتی تـــێ بـــڕوا
هـــەتـــا حاڵـــی دڵ بـــەو جـــۆرە وابـــێ
ڕەحمـــەت لـــە ســـڕڕی خـــودا ئاگـــا بـــێ
خـــۆ ڕەزائیلـــیش دەردێ وەهانـــە
دەوای خـــارجی ســـاحەی ئیمکانـــە
مـــەگـــەر بـــە دەوام ریـــازەی شـــاقە
حاســـڵ کـــا بـــۆ دڵ شـــیفا و ئیفاقـــە
ئەویش بـــۆ نـــەخـــۆش ڕەحمـــەتـــە بكـــرێ
مـــەگـــەر داوێـــنی دوکتـــورێ بگـــرێ

دوکتــوری ئــەویــش(عــارف بــالله)یـــە
بـــــە دەســـــــتوراتی دەوا ئاگایـــــە
چون ئەووەڵ ئەویش هـەر وەک ئـەو بـووە
لـــە بـــەردەس زاتـــێ تـــرا دەرچـــووە
بـە پێـی مـەهــارە و تـەبابـەتـی خـۆی
ڕەزیلـە یـەک یـەک بـژار ئـەکـا بـۆی
هـــەر ڕەزیلـــەیـــەک لـــە دڵ دەربێـــنێ
فـــەزیلـــەیـــەکـــی لـــە جـێ ئـــەچێـــنێ
پـــەروەردەی ئـــەکـــا ئـــەو خولقـــە وەهـــا
ئـــەیگـــەیـــەنێـــتە حـــەددی ئینتیهـــا
کـــە ڕەگـــی ئـــەو گشـــت دەردە بـــڕاوە
بـــە کـــەماڵـــی خـــوی چاکـــە ڕازاوە
وا ئیتـــر ئیبلـــیس کـــاول بـــوو جێـــگەی
نیســـبەتـــی نـــەمـــا ســـەدکـــرا ڕێـــگەی
پاش سەیقەلی دڵ لـە ژەنگـی قـەسـوەت
وەسڵی بـە حـەددی ئینتیهـای سـەفـوەت
شێـخ ئـەو دەمـە ڕوی دڵـی تـێ ئـەکـا
تـەی مـەقامـاتی هـەمـوو پـێ ئـەکـا
لـــە ئـــەوەڵیشـــۆ هـــەتـــا ئـــەگاتـــە
تـــەی نیهایـــەتـــی ئـــەو مـــەقاماتـــە

دەستی ئیمدادی مورشدی ئەوێ
تا لە ڕیازە پەکی نەکەوێ
هەردەم بە شەهدی وەجدێکی تازە
لە بۆی خۆش ئەکا تاڵی ڕیازە
لە ئینعکاسی مورشدی خۆیان
حالاتی عەجیب ڕوو ئەدا بۆیان
بە ئیندراجی ڕوتبەی نیهایەت
له سینەی شەخسی ساحێب بیدایەت
پایەی شوهود و مەقامی حوزور
کە ئەعلای گشته بۆی ئەکا زوهور
بەعزێ لە تەکمیڵ ئێشتاکو دوورن
دارای مەقامی(کشف القبور)ن
ئەچنە سەر قەبر و حەواس سەد ئەکەن
دەرکی ئەحواڵی چاک و بەد ئەکەن
وەختێ حیجابات پەی بوو سەراسەر
مەقامات هەموو تەی بوو هەتا سەر
یەک لەحزە بە ڕۆح وەک سەیلی ئەملاک
گەشت ئەکەن هەموو ئەقتاری ئەفلاک
بە تەبەقاتی دۆزەخ و جەننەت
ئەگەڕێن بە بێ لەززەت و میحنەت

بێ خەو بە خزمەت پێغەمبەر ئەگەن
موتاڵەباتیان لە لا عەرز ئەکەن
موختەسەر قووەی بلێسەی ئەنوار
لەت ئەکا پەردەی عالەمی ئەسرار
هەر کەس ئینکاری ئەمەکا.ئەگەر
بڕوای بێ بە فەرموودەی پێغەمبەر
بۆ ئیسبات لە بۆی ئەخوێنمۆ منیش
هەر لە(بی یسمع)هەتا(بی یبطش)
زوبان لە شەرمی حاڵی بزرگان
مەرکەبی نوتقی لەنگە لە مەیدان
دەرگای ئیستیغنا گەر بێتو داخەن
بە زەڕڕە فەرقی شا و گەدا ناخەن
نیسبەت بە قەسری قوربی ئەعلایان
وەک سواڵەتێکە دنیا لەلایان
کەسێ لە مەیلی جەننەت بەری بێ
ئەبێ دنیا لای قوربەتی چی بێ
ئەوان بێمەیلی باغی نەعیمن
عاشق جەمالی وەجهی کەریمن
فی المثل ئەگەر ئەنواعی تەعام
پوخت ولەزیز و خۆش‌بۆن و خۆش‌تام

لـە سـەر سـینیـیـەک تـەرتیبـی بـدرێ
ئەمجا شـەخسێـکیش موخـەییـەر بکـرێ
لــە بــەینـی ئــەوە و ڕەئیســی شــارێ
نفــوزی تــەسـلیم بکـرێ بــە جــارێ
مەر نەفسی تەواو دەنـی و خـەسـیس بـێ
ریاســەی نــەوێ و نــانی پێــویس بــێ
لـە وەزعــی ئـەوان عــەجـەب مـەمێـنە
دەرحــەقیــان تــەردیـد بـە دڵ مـەیـەنـە
ئــەوان عولــەمــای عــالی و ڕەببــانین
پێــوەبــوی داوی جیفــەی دنیــا نــین
بــە باڵــی هیممــەت خــارجی دنیــان
واریســـی عیلمــی فیرقــەی ئــەنبیــان
زەریــف حاڵــی بــە بـەم دوو کــەلیمــە
کـە چـەنـد پایـەیـان بـەرز و عـەزیمـە
بـێ شـک حیکمـەتـی ئیرسـالی ڕەسـووڵ
لـە پـاش تـەبلیغـی ئـەحکـام و ئوسـوڵ
لــــە بــــۆ(افاضـــــه) و (استفاضــــه)بــــوو
دوا خۆیان بە مـان (تفـویض)یـان فـەرمـوو
چـۆن حــەق لــە کــەمــاڵ (تقـدس)ایــە
•عــەبـدیش لــە ئــەدنــای (تــدنس)ایــە

بـێغایـەت نیسـبەت لـە بـەینا دووره
بـۆ جـەلبـی فویـوز بـەرزەخ زەرووره
دوا روسـول ئـەمـان واسـتەی بـەیـنن
یـەعنـی بـەرزەخـی ذوالجهتیـنن
لـەولا موتتـەسـف بـە خـولقی حـەقـن
لـەم لاوه لـە سـەر سـورەتـی خـەلقـن
نـزیکن لـە خولـق بـۆ (استفاضـه)
بـە خـەلقـیش ئـەنجـام ئـەدەن (افاضـه)
هـەتـا زەمـانی مـەهـدی ئـەمانـە
ئـەبـێ هـەر بـبن وەعـدەی خۆیانـە
بەڵام ئەغلەبیـان مـەخفـی و مـەستوورن
دائـیم موسـتەغریـق تـەجـەلـلای نـوورن
قیسمێ هەر ئـەبـێ مـەجزوبـی حـەی بـن
بـەعـزێتـر لـەوان رجـال الغیـبن
لـە کـەونـا لـە لای خـواوه مـەئمـوورن
بە چـەنـد (منصِب) و عـەدەد مـەشـهوورن
سێسـەد و پـەنجـا و پێـنجه عـەدەدیـان
مـەئیوسـمان نـەکـا خـوا لـە مـەدەدیـان
لـە وانـە سێسـەد هـەر نوقـەبایـە
بـەرەو ژور لـەوا چـل نوجـەبایـە

گەرەتر لەوان ئەبدال حەوت کەسن

ئومەنائولـلا و عالی و ئەقدەسن

چواریتریشیان ئەوتادیان ناوە

چوار ڕوکنی عالەم بەوان وەستاوە

سێ کەسیش ئەفراد عالی جەنابن

لەناو دائیرەی (قطب الاقطاب)ن

(قطب الاقطاب) یش فەردێکی وایە

ڕەئیسی تەواو گشت ئەولیایە

ئەمە بۆ هەرکەس بوو بە مەرتەبە

بە غەوسی وەقتی خۆی مولەققەبە

لە بەرەکاتی ئەمانۆ، خودا

لە بەلای عامە مەخلوق لائەدا

دنیا لەمانە چۆڵ نابێ ساتێ

تا دەمی(یوم ینفخ)ئەگاتێ

بەعزێ زاهرن ئەهلی ئیرشادن

مەشغوولی سەیقەل قەلبی عیبادن

بە ماڵ و بە حاڵ بە ڕۆژ و بە شەو

خزمەت و کۆمەک ئەکەن بەم و بەو

بە دەنیان مەوقوف بۆ خزمەتی خەلق

ڕۆحیشیان واقف لە خزمەتی حەق

لــەگــەڵ کــەماڵــی ئــەدەب و ئــیخلاس
هــەرکــەس بناســێ تــەبیبــی حــەقنــاس
توند بــە دڵ ڕشــتەی مــەحــەبیــەت بگــرێ
ســەعــادەت ئــەبــا ئــەو ڕۆژە ئــەمــرێ
وەفقـــی(المـــرء مـــع مـــن احـــب)
شــاد ئــەبــێ سبەی بــە علــوی (منصِــب)
ســـاخوا تۆبیـــو زولجـــەلالـــی خـــۆت
بـــە عـــەزەمـــەت و لا یـــەزالـــی خـــۆت
وەهـــا برێـــژە لـــە هـــەوری ئیحســـان
بـــە ســـەر دێـــمی دڵ بـــارانی عیرفـــان
کـــە بـــاغی هیـــوام بـــۆ بێنێـــتە بـــەر
چەشمەی خۆشبــەختــیم بــۆ بخاتــە ســەر

## بەیانی فائیدەی سلوک و پەیڕەوی ئادابی تەریقە

ئـــەمجـــا براکـــەم ئـــەمـــەش بزانـــە
کــە ســوودی گــەورەی تــەریقــە دووانــە
ئــەووەڵ تــا دڵــت بــە بۆتــەی تــەوحیــد
پــاک بێــتۆ لــە ژەنــگ تــەقلیــد و تــەردیــد
دوهــەم تــا ئــەعمــاڵ هــەرچیــت بۆکریــا
ئــەویــش خاوێــن بــێ لــە عوجــب و ڕیــا

چون ئـەبێ لـە بـای خـەتـەرەو تـەردیـد
موحـــافزەکــەی فانۆســـی تـــەقلیـــد
بـەڵام خورشـیدی شـوهود کـە دەرکـەوت
بـێبـاکی لـە بـای بـەڵای چـرا نـەوت
لـە حینـی حـوزور شـای بـە حـەمییـەت
کــوا مــەجــالی ڕوو بــۆڵای ڕەعییــەت
بــە ئینســـان ئــەکــا ئــەو عیبــادەتــە
کـە نرخـی موڵـکی گشـت سـەعـادەتـە

**بەیانی ئەمە کە تەریقەکان هەموو حەقن بەڵام**

**لە سوود و نزیکیانا دارای فەرقن**

لــە بــەحــری فــەیــزی ڕەســول اللهوە
شـــەتتـــی تـــەرایـــق ئیجـــرا کـــراوە
هەریەک لە یـاران گـورج بـە دەس و بـرد
لەو بەحری فـەیـزە نـەهرێـکی هـەڵـکرد
بــۆ ســەر مــەزرەعــەی قولـوبی عیبــاد
ئاودێــری چــەمــەن ســەربــەرزی میعـاد
لـەوانـیش هـەریـەک بـە چـەنـد فـروعێ
جۆگــەی لـــێبـــووە بۆچـــەنـــد زروعـــێ
هــەر فــەرعــێ لـەوان تـەریقـەیـەکـە
تـەسـمیەی بـەنـاو سـەر حـەڵـقەیـەکـە

وەک نــەقشــبندی و قــادری و چــەشــتی
کـــوبرەوی و بـــاقی تـــەرایـــق گشـــتی
هــەمویــان لــوببی شــەرعــی ئــەنــوەرن
ڕەوشــتی گــەورەی فــەخــری بــەشــەرن
ئــەممــا تــەریقــەی عــالی نــەقشــبەنــد
بــە بــێ‌ڕیــازە و بــێ‌کــەمــەنــد و بــەنــد
لــەوان نزیکتــر لــە هــەمــوش ئــەســبەق
موسڵــی عــەبــدە بــە حــەزرەتــی حــەق
چون ئەخلاق بــەســتەی ڕوشــتەی قولــوبن
قولــوبیش شــەیــدای خــولقی مــەحبــوبن
لە پێــش و کــەم کــەم بــە حــوببی خۆیــان
تفلّــی دڵ بــەخێــو ئــەکــەن لــە بۆیــان
هەر دەرسی عیشقی خــۆی پــێ ئــەخوێــنێ
تــا فــەننــی فــەنــای لــە بــۆ ئــەنوێــنێ
یــەعنــی بــۆ هــەرلا نــەزەر کــا موریــد
ئــەبیــنێ ســورەت میســالی موڕشــید
لــە تــەوەجــوهی مورشــید ۆ گــاه گــاه
ئـــــەبیســـــــێ لـــــــە دڵ الله . الله
گــەر دەوام بکــا ئــەو زیکــرە جــار جــار
ڕوتبـــەی ئـــەچێـــتە ســـلطان الأذکـــار

یــەعنــی لــە تــەاو زەڕراتــی وجــوود
ئــەبیســێ زیکــری حــەزرەتــی مــەعبوود
کــە لــە فــەنــای پیــر گــەیشــت بــە پایــە
نۆبــەی دەرســی عیشــق رســول الله یــە
چونکــە نیســبەتــێ وا پــەیــدا ئــەکــات
کــە بــە ئیبتــدای عیشــقی ئــەو بگــات
بــە ئیلقــای درووس (تلمیــذ)ی قــەلبــی
ئــەبــا بــۆ ڕوتبــەی (فــەنــا فــی النبــی)
ئــەبینــێ نــەزەر لــە هــەر شــتێ پــاک
بکــا ســـوورەتــی میســالی لــەولاک
کــە گــەییــە پایــەی (فــەنــا فــی الرســول)
(مرشــح) ئــەبــێ بــە ڕوتبــەی وســول
یــانێ بــۆ کــەسبی مــەحــەبیــەتــی حــەق
لادانــی ڕوی دڵ لــە جــەمیعــی خــەلــق
بــە تــەوفیقــی حــەق تــەربیــەی پیــران
ئــەوا گــەیــانی بــە وەسڵــی عیرفــان
کۆمــەکــی موڕشــید لــەم جێــدا حــەتمــە
وەک شەمــس ئــەفــەرمــوی علیــە الرحمــە
لە مەزلەقەی ســەخــت (فــەنــا فــی الله) دا
هۆشــیبــێ موریــد نــەیــە بــە لادا

هەرچەند تەواو بێ مورید لە دەرکا
بێمورشید زەحمەت ئەو ڕێگە دەرکا
لەولای فەناوە فەنای فەنایە
یەعنی لە فەنای خۆی بێئاگایە
ئەمجا رجوعی قەهقەری ئەکات
هەتا بە (بەقا باللە)ی ئەگات
لەو بەینەدا چەند موراقەباتە
تەعلیمی دەستوور نەفی و ئیسباتە
وەک موراقبەی (معی و صمدی)
یا (اقربیە) لە گەڵ( احدی)
پاش موراقبەی ئەسما و سیفات
نۆبەی دێ تەعلیم موراقبەی زات
مەقاماتی ئەم فیرقەی کیرامە
مەجمووعی ئەڵێن هەژدە مەقامە
شمس الاشرافی عالی دەرەجات
فەرمویە ئەووەڵ کەشف و کەرامات
ورداتی غەیب هەم موشاهەدات
قووەی ئیدراکی بۆ موعایەنات
تەلوین و تەمکین نزول و ئافەت
بەهرە و فەوائید عالەمی قوربەت

شـــوهودە و فـــەنـــا (فنـــاء الفنـــا)
بـــەقايـــە و لـــە گـــەڵ (بقـــاء البقـــا)
فـــەوقـــى دەرەجـــات نـــور الانـــوارە
ئـــەعـــلا دەرەجـــەی شێـــخی كوببـــارە
تـــا نورالانـــوار لازمـــە مورشـــيد
دەس بـــەردار نـــەبـــێ لـــە حاڵـــی موريـــد
كـــە بـــەو مـــەقامـــە زانـــى واسڵـــە
مورشـــيدى نـــاوێ خۆيشـــى كامڵـــە
تـــا مورشـــيد ڕوتبـــەی بـــەو جێـــگە نـــەگـــات
ئـــەڵێـــن خـــەتـــەرە بـــا ئيرشـــاد نـــەكـــات
ئيبتكـــارى حاڵـــى ئـــەم بزرگانـــە
ڕەشـــە بـــاى گوڵـــى چـــراى ئيمانـــە
تێـــكەڵـــی و تـــەركـــی ئـــەدەب و ويقـــار
حيجابـــە و ســـەبـــەب بـــۆ دەردى ئينكـــار
مـــەر هـــەر كليلـــی ئـــەدەب و حـــەيـــا
هـــەڵـــگرێ قـــاپى فـــەيـــزى ئـــەوليـــا
هۆی ســـروەی ســـەبـــای لوتفيـــان ئـــەدەبـــە
واســـيتەی جۆشـــی عـــەتفيـــان ئـــەدەبـــە
ســـەبـــەبـــی فـــەوزى فـــەيزيـــان ئـــەدەبـــە
جـــالبی مـــەيلـــى بـــەرزيـــان ئـــەدەبـــە

مەدەدیان ناگا بە بێ ئەدەبان
سا خوا نەمانکا بە بێ ئەدەبان
ناسینیان لە بۆ دنیا پەرستان
مەنعە وەک جەمعی تەموز و زستان
بەڵام لەم عەسری (شرالاعصار)ە
مودەعی زۆرە و کەم ئەهلی کارە
هەرخۆیان ئەغلەب دارای ڕەزیلەن
کەی ئیتر لە بۆ خەلاس وەسیلەن
بێ کەسب و سلوک بەعزێ لە جێی خۆی
شێخی بە ئیرسی دەسی داوە بۆی
زاهیرەن لەفزەن پێی ئەڵێن مورشید
(والله علی معناه شهید)
تەریقە عیلمێ گەورە و گرانە
ڕێگەی کەم کەسێ پڕ هونەرانە
جیانی یە لە شەرع تەریقەت هیچی
گەر لایدا ئیتر تەریقەتی چی
ئیستە ئەم عیلمە شەریفە خاسە
مەلعەبەی زومرەی (عوام الناس)ە
وەک نەیشی زانی جاهیل نەیپرسی
کە وەرناگیرێ عیلم بە ئیرسی

کەسێ لە خوێندن وەختی خاڵییە
لە عیلمی باوکی چی لێ حاڵییە
درەخت نەنێت و خەیاڵی بەری
تێری لێ ئەخوا ئەی خاک بە سەری
لای ئەهلی عولوم خوسوس ئەوانە
کە دین لە لایان ڕۆحی ڕەوانە
مەعلوومە لایق بە ئیرشاد کامە
کێ دارای بەرزی ڕوتبە و مەقامە
بە عەزمی سابت بە نییەتی ڕاس
لە گەڵ کەماڵی ئەدەب و ئیخلاس
ئەچنە حوزوری تا مەنجەڵی دڵ
بۆیان بە فەیزی سینە بێتە کوڵ
موریدیان ئەغلەب یا عولەمایە
یا عەوامێکی ژیر و دانایە
جا گەر ئەزانی دڵت نەخۆشە
نەجاتت لە دەس مەرەز پێ خۆشە
ڕێگەی بیمارە ناشێ نەزانی
توند بگری داوێن عوسمانی سانی
بێشک دوکتووری دەردی دڵ ئەوە
مەحەللی حەللی هەر موشکڵ ئەوە

دەواداری گشـــــت دەردە دارانـــــــە
مـــەرجـــەعـــی ئـــەربـــاب دڵ بێـــدارانە
بە ڕۆژ و بـە شـەو مـەحـزی ڕەزای حـەق
دەریغـــی ناکـــا لـــە خزمـــەتـــی خـــەلـــق
نـــەقـــدی کـــەمـــاڵات مـــەعـــاریفی گشـــت
لـــەگـــەڵ فـــەزائیـــل هـــەمـــوو گرتـــە مشـــت
یوســـفی میســـری حوســـنی ئـــەخلاقـــە
مـــەزهـــەری ســـیفات خـــودای خـــەللاقـــە
سوڵـــتانی مـــەســـنەد ئیقلیمـــی ئیرشـــاد
لوقمـــــانی چـــــارەی قولـــــوبی عیبـــــاد
مـــەحبـــوبی تـــەواو ئـــەولیـــای کیـــڕام
نـــــائیبی حـــــەزرەت ســـــیدالانام
شـــاهی بـــە تـــەمکـــین موڵـــکی مـــەعـــانی
جـــێداری شـــاه و غـــەوســـی گـــەیلانـــی
دارای خـــەزائـــین گـــەنجـــی کـــەڕامـــات
(واصل) بـــە ئـــەقســـای ڕوتبـــە و مـــەقامـــات
واســـیتەی وســـول ســـالیک لـــە ناســـوت
بـــە ئـــەعـــلا ئـــەوجـــی مـــەقـــامی لاهـــوت
وەک شـــاهی جـــەیلـــی و فـــاروقی ئـــەحمـــەد
قـــوتبی ڕەببـــانی سوڵـــتانی ســـیرهەنـــد

دەرچوو لـە سـارای پـوختی حـەوتـەمـین
لێـی نـەنیشـت گـەردێ لـە گـردەنشـین
لـــە خێـــمەی تـــەکمیـــل دەوائیرگشـــتی
بـون بـە یـەک نگـین چونـە ئـەنگوشـتی
لە چەند بـەدری بـورج سـەمـای ئـەنـوارۆ
لە چەنـد غـەوواسـی بـەحـری ئـەسـرارۆ
بـــەرلـــە زوهـــوری مـــوژدە دراوە
کـــە قوتبییـــەتـــی بـــۆ دانـــراوە
بـــۆ ئـــەوەی جۆیـــای نـــوری یـــەقینـــە
وجـــودی میشـــکات ســـڕاجیدینـــە
تـــووتی نـــەیســـتان قـــەنـــدی هیدایـــەت
قومریـــانی بـــاغ دەرک و دیرایـــەت
پـــەروانـــەی چـــرای جـــەمالّـــی ئـــەون
پابـــەنـــدی شـــەهـــدی کـــەمالّـــی ئـــەون
تانەی تەعـەسسـوب دیـدەی بـەسـیرەت
گـەربـێ بـە پـەردەی عینـاد چ حیـرەت
خـۆ کوێـری زکمـاک جـەهلـیش یـەقینـە
نـــابینێ چـــی جـــوان چـــی ناشـــیرینە
دیـــدەی دانـــایی پـــڕ ســـورمەی ئینســـاف
نـــاتوانێ بـــە حـــەق نـــەکـــا ئیعتیـــراف

خـــودا بـــە جـــاهی ئـــەم زاتـــە کـــەوا
لـــە دەردی قـــەســـوەت دڵ ئـــەکـــا دەوا
پێـم کـەرەم فـەرمـوو هـەرچـی مـەرامـە
هەر چـی هـۆی خۆشـی بـۆ هـەردوولامـە
دڵ مونـەووەر کـە بـە نـوور مـەعریفـەت
لە پاشی سەفـوەت لـە دەریـای ڕەحمـەت
غایـە مـەحـەبـەت فـی بـەسـیرەتـە
حوســـنی خاتیمـــە و هـــەم عافیـــەتـــە

## وەڵامی ڕەخنەگرەکان لە دین پەروەری گرۆی پێشینان

والـەبـۆ مـونسـیف حـەڵلـی موشـکڵ بـوو
دەوای دەردەکـە دەرجـی مـوسـهیل بـوو
کـە پـاکی کـردۆ بـە دەسـڕەی بوڕهـان
دوکـەڵـی شیشـەی گڕسـۆزی ئیمـان
لـە بـەر مـەشـعەلـەی زەریـف ئـەبیـنێ
کـێ وەک پـەپولـە خـۆی ئـەسووتێـنێ
یـا کـێ بـە داوی عـەلاقـەی جیهـان
گیرئەبێ و نەڕۆیشت بـۆ گـەشـتی جینـان
(تفضـیل)ی ئاسـن لاسـیک و بـەنـزین
بـە سـەر کونـوزی جـەواهیـری دیـن

لــەو کــەســانەوەن جاهیــل بــە دیــنن
دڵچۆڵـــی نـــووری چـــرای ئـــایینن
ئــەوەنــدە لــە حــەق دوور و بــێفکــرن
بە ســەنعــەت بــە دیــن بــەهانــە ئــەگــرن
خۆیــان چــل ساڵــە دینیــان بــەرداوە
بــە تــەمــای ئــەوە نــەکــەونــە دواوە
کوا پیشــەیــەکیــان کــە پێــی پێش کــەون
ئــەونــە لــە دووتــۆی پــەستی نــەخــەون
بــەم مــاوە حــەتتــا یــەک نووکــە دەرزی
بــە پیشــەی دەرزیــش نــەگــەینە بــەرزی
ئــەربــابی ســەنعــەت وەک ئــەوانــە نــین
ئیســتیهزا بکــەن بــە مــەزهــەب و دیــن
ئــەغلــەب هــەر پیشــە و زانســتی خۆیــان
بــو بــە ئــەســبابی ئیعتــراف بۆیــان
بــە حــەقیقــەت وڕاســتی ئــەم دینــە
کــەوا ناســخی هــەمــوو ئایینــە
یــەکــێ لــە خــەبیــر عیلمــی نــەباتــات
لــەو عیلمــە تــەواو بــە پایــە ئــەگــات
بــەو فــەننــە حاڵــی ئــەبــێ لــە هــەرکــوێ
گیــا دەربــێ بــەجــووت نێــر و مــێ ئــەڕوێ

